# پرشنگی رۆژی کوردەواری

# لە شەرحی بوخاری



دانەر

مەلا حسین شێخ سعدی

نووسینەوەو ئامادە کردنی بۆ چاپ

بەشیر حسین سعدی



بەرگی حەوتەم

لە ساڵی ١٩٥٢ دانراوە

# پرشنگی ڕۆژی کوڕەواری
# لە
# شەرحی بوخاری

دانەر
مەلا حسین شیخ سعدی

بەرگی حەوتەم

نووسینەوەو ئامادەکردنی بۆ چاپ
بشیر حسین سعدی

لەساڵی ١٩٥٢ داندراوە



وێنەی دانەر
مەلا حسین شێخ سەعدی
١٩٨٣-١٨٨٣

# مێژووی ژیانی دانەرو داندراوەکانی لەچەند دێرێکدا
## ١٩٨٣-١٨٨٣

ناوی تەواوی مەلا حسین شیخ سەعدی فەیزوللایە نازناوی لەئەدەب (فانی)یە وە لەهەندێ هەلبەستی نازناوی (کاکە)ی هەلبژاردووە. بەڕەچەلەک لەعەشیرەتی بلباسە لەتیرەی (بەرچەم) لەسالی ١٨٨٣ لەشاری هەولێر هاتوتە دونیاوە لەتەمەنی شەش سالیدا لەبەر خوێندن داندراوە لەمزگەوتی گەورەی هەولێر کە ناسراوە بە مزگەوتی بازاڕ پاشان لەزۆر جێگا گەڕاوە بۆ خوێندن لای مەلا ناودارەکانی ئەوکاتە وەکو مەلا عبداللەی جەلی زادەو مەلا صادق لە مزگەوتی شێخ جامی لەشاری کۆیێ و لای مەلا ئەحمەدی سکتان و اجازەی مەلایەتیشی لەهەولێر لای مەلا ابو بکر عمر افندی وەرگرتووە کە ناسراوە بە (مەلا فەندی).

بۆ یەکەم جار لەگوندی قەپلان بوەتە مەلا پاشان چووە گوندی سیاوو خورمەلەو سوریژەو دووگردکان لەسالی ١٩٤٧ لە دووگردکانەوە هاتە هەولێر بوو بە مەلای مزگەوتی -دارتاشان-.

لەماوەی ژیانیدا هەروەکو خۆی دەی فەرموو (٣٠) سی سال هەر خەریکی خوێندن بووە و (٢٤) بیستو چوار سالیش دەرسی بە فەقێیان گوتووە لەو گوندانەی باسی کراو وە هەر خەریکی دانانی پەرتووکی ئایینی و دانانی هەلبەست بووە، ئەوا لەخوارەوەش داندراوەکانتان بۆ باس دەکەین.

١- ژیانی ئنسان تەفسیری قورئان کە شەش بەرگە وە هەموو بەرگەکانی بلاوکراوەتەوە ئەو پەرتووکەی لەسالی ١٩٣٠ داناوە بەیەکەم تەرجەمەو تەفسیری قورئانی پیروز دادەندرێ لە کوردیدا. وە لەلایەن زۆربەی مەلایانی کاتی خۆی پەسندکراوە.

٢- پرشنگی ڕۆژی کوردەواری لەشەرحی بوخاری کە ئەوەشیان دەبەرگە ئەوەی بەردەستتان بەرگی شەش لەم پەرتووکە کە شەرحی حەدیثەکانی بوخاریە بەکوردی.

٣- دیوانی هەلبەست بەناوی (دیوانی فانی) لەسالی ١٩٨٤ بلاوکراوەتەوە.

٤- تەرجەمەی قەصیدەی بوردیە بەکوردی لەسەر هەمان کێش و سەروا لەسالی ١٩٨٥ بلاوکرایەوە ئەو پەرتووکانەی سەرەوەم هەموو بەچاپ گەیاندووە ئەو پەرتوکانەی کە هێشتا بەچاپ نەگەینراون ئەمانەی خوارەوەن:

١- حقائق الخیام: تەرجەمەی شیعرەکانی (خەیام)ـە بەزمانی عەرەبی.
٢- شەرحی جامع الصغیر بەکوردی کە سێ بەرگە.
٣- شەرحی ذات الشفا بەکوردی.
٤- شەریعەتی ئیسلام لەچوار مەزهەب.
٥- شەرحی لەمەعات بەعەرەبی.
٦- المنظوم فی العقود کە بریتی‌یە لە (٧٨٧) دێر هەلبەست بە زمانی عەرەبی کە باسی فقهی شافعی دەکا.

وە لەبەرواری ١٩٨٣/١٢/١١ لەشاری هەولێر ئەو زانایە کۆچی دوایی کرد.

**بشیر حسین**
بلاوکەرەوەو کوری دانەر

٨٠٠: عَن أَبي بكرةَ (ض) الزَّمـانُ قَدْ استـدارَ كَهيْئَةِ يومَ خَلَقَ اللهُ السمواتِ وَالأرضَ السنَةُ اثنا عَشَرَ شَهراً مِنْها أَرْبَعةٌ حُرُمٌ ثلاثٌ مُتَواليِاتٌ ذوالقَعْدة وَذوالحجة والمحرَّمُ وَرَجَبُ مُضَرَ الَّذي بَيْنَ جُمادَي وَشَعْبانَ.

## تەرجەمە

٨٠٠: دەگێـڕنەوە لەئەبی بەکر (ناوی نوفـەیعی کوڕی حـارثی ثەقـەفی بوو -ڕەزای خودای لێ بی- گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی زەمان وەکوو ئەو ڕۆژەی لێ هاتەوە کە خودا دروستی کرد ئاسمان و عارد. یەعنی ئەو عادەتەی عەرەب کە جینادەی کوڕی عەوفی کنانی داینابوو تێکچوو [بەم تەرزە ئەگەرچی چوار مانگیان لەمانگەکانی ساڵ دەگێڕا بەموحتەرەم و بەڕێز. بەڵام بۆ ئەوەی مەبەستەکانی خۆیان جێ بەجێ بکەن ڕێز گرتنەکەیان نەدەگێـڕا بۆ چوار مـانگی دیاری کـراو بەڵکی ڕێز گـرتنەکـەیان جـودا دەکـردەوە لە دیارکـراوەکـان بەهەوەسی خۆیان. ئەیاندا مـانگێکی تر هەر بە قـسـەی خۆیان مـانگی دیارکراو ڕێزی نەدەگیرا. هەتا بەم غـایەتە لەهەر مانگێک بەخۆیان هەوەسایان لێ بوایە دەیان کردە مانگی حەج بۆیێ زومەخشەری و ئەوانی تریش گوتوویانە حەجی ئەبو بەکر کە لەپێش حجة الوداع بوو لەمانگی ذی القعدة کرا. بەڵام حجة الوداع لە ذي الحجة بوو. ئنجا بۆ دیارکردنی مانگەکانی بەڕێزو موحتەرەم ئەم حەدیثە هات کە فەرمووی). ساڵ دوازدە مانگە لەم دوازدانە چواریان بەڕێزن بەڵام سێ لەم چوارانە لەدوو یەکترین ذو القعدە و ذو الحجە و موحەرەم. مانگی ڕەجەبیش زۆر لای عەرەبستانی (موضەر) بەقەدرو بەڕێزە کەوتۆتە بەینی دوومانگی جماذو مانگی شەعبان.

٨٠١: عَن أَبي ذَرٍّ (ض) تَدري أَيْنَ تَذْهَبُ فـإنَّها تَذْهَبُ حَتّى تَسْجُدَ تَحْتَ العَرش فتستأذِنَ فيُؤْذَنَ لها ويوشِكُ أَنْ تَسْجُدَ فَلا يُقبَلُ مِنْها وتَستأذِنُ فَلا يُؤذَنُ لَها يُقالُ لَها ارجِعي مِنْ حَيْثُ جئتِ فَتَطْلُعُ مِنْ مغربِها فذلِكَ قَوْلُهُ تعالى والشمسُ تجري لِمستَقَرٍ لَها ذلِكَ تقديرُ العزيزِ العليم.

## تەرجەمە

٨٠١: دەگێڕنەوە لەئەبو ذەڕی غـفاری ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) وەکوو ڕۆژ ئاوابوو ڕاستـەوخـۆ بەمنی گـوت دەزانی ڕۆژ بوکوێ دەچی؟ گـوتم خوداو پێـغـەمـبەری خودا باشتر دەزانی. ئەمە بۆیێ دەچی هەتا سەجدە بیا لەژێر عەرش ئنجا ئیزن دەخوازی کە

لەرۆژهەلات هەلبێ. لەسەر عادەتی خۆی ئیزن دەدرێ وە نزیکیش دەبی کە سەجدە ببا وە ئیزنیش دەخوازی کە بۆ شوێنی لێ هاتن کە ڕۆژهەلاتە بچێ ئیزنیش نادرێ بۆ ئەوێ بچێ پێی دەگوترێ بگەڕێوە ئەو جێگایەی کەلێ هاتووی یەعنی بگەڕێوە سەر خەتی ڕۆژئاوات. ئنجا لە ڕۆژئاوا پەیدا دەبی بۆ عالەمێکی تر. دەبیتە سبەینە بۆئەوێ وە دەبیتە شەو لای ئێمە ئەمەیە فەحوای ئایەت کە دەفەرموێ.

جرمی خۆر دەگەڕێ و جەرەیان دەکا لەم دوو عالەمە ئەگەر لەیەکێک ڕۆژێ لەویتر شەوە وە پێچەوانەش(١) لەبۆ مونتەهایەک و موستەقەرێک کە دوو مەغریب و دوو مەشرقە. وەکوو ئایەت دەلێ (رب المشرقين ورب المغربين...]. لەسورەتی: الرحمن. بەم حەدیثە پیرۆزەش سەلمێنرا کە عارد خرۆکی‌یە (کروی)یە. چونکی لای ئەهلی سونەت عارد -راست و راستە- واتە -مسطحە- مەعنای ئەم حەدیثەشیان بەعەلامەتەکانی هاتنی قیامەت داناوە کە ڕۆژ لە مەغریبە بۆ سەر ئێمە لەم حەدیثەش تایبەت مەندیەک (تەخصیصی)ەک نی‌یە بۆ سەر ئێمەو غەیری ئێمە).

٨٠٢: عَن أَبي هريرة (ض) الشمسُ والقَمرُ مُكوَّرانِ يوَمَ القيامَةِ.

**تەرجەمە**

٨٠٢: دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی خۆرو مانگ پێچرانەوە ڕۆژی قیامەت ڕۆناکیان نامینێ.

٨٠٣: عَن عائشةَ (ض) ما ادري لَعَلَّهُ كما قالَ قَوْمٌ فلَمَّا رأوهُ عارضاً مُستَقبِلَ اودِيَتهم الآية.

**تەرجەمە**

٨٠٣: دەگێرنەوە لە حەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بی وەکوو چاوی بەهەورێکی وا بکەوتایە. لێ بوەشایایەوە بیاری تەماشای دەکردو بەری لێ دەسوڕاندو دەچووە ژۆرێ و دەهاتە دەرێ (واتە دەپەشۆکا). پاشان وەکوو دەباری ئەو پەشوکانەی نەدەما. هێمن دەبۆوە ڕووی پیرۆزی گەش دەبۆوە. منیش پێم گوت بە بەدیارکەوتنی هەور حالەتێکی وا لەتۆ

(١): هەروەکوو ئێستاکە دەبینێن ئەگەر لەناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کەلای ئێمەیە ڕۆژ بی لەنیوەی تری گۆی زەوی واتە لە دوو ئەمریکای شمالی و جنوبی شەوە. (بلاوکەرەوە).

دەبینم. فەرمووی نازانم لەوانەیە ئەم هەورە وەکوو هەوری قەومی عاد بێ. وەکوو چاویان پێ کەوت دڵخۆش بوون. گوتیان بارانمان بۆ دێ. کەچی پڕبوو لە عەزاب، منیش ترسم هەیە عەزابی تیابێ. وەکوو بارانیشی لێ هات ترسم نامینێ وە دڵم خۆش دەبی.

٨٠٤: عَن عبدالله (ض) إنَّ احَدَكُمْ يُجمَعُ خَلْقُهُ في بطنِ أُمِّهِ اربعينَ يَوْماً. ثُم يكونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذلك. ثُمَّ يكونُ مُضغَةً مِثْلُ ذلِكَ ثُم يبعثُ اللّهُ مَلَكاً وَيُؤمَرُ باربع كلِماتٍ ويقالُ لَهُ اكتُبْ عَمَلَهُ وَرِزقَهُ وَاَجلَهُ وشقيٌّ أو سعيدٌ. ثُمَّ يُنفَخُ فيهِ الرّوحُ فانَّ الرَّجُلَ مِنكُمْ لَيَعمَلُ حتّى مايكَونُ بَيْنَهُ وبينَ الجنَّةِ إلاّ ذراعٌ فيسبِقُ عَلَيْهِ كتابُهُ فيَعْمَلُ بعمَلِ اَهْلِ النّارِ ويعَملُ حتّى مايكونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النّارِ إلاّ ذراعٌ فيسبِقُ عليه الكتابُ. فيعمل بِعَمَلِ اهل الجنّةِ.

**تەرجەمە**

٨٠٤: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عەبداللەی کوڕی مەسعود ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د). ئامۆژگاری ئێمەی دەکرد کە لەهەموو ژیانی خۆشی هەر ڕاست بووە لەقسەی خۆی و نسبەتی ڕاستیشی وەبال دراوە لەوەعدی خودای خۆی فەرمووی بەبێ گومان هەر یەکێک لەئێوە لەپاش هەڵڕژانی نوطفە بۆ ناو ڕەحمی دایکی جەستەی ئەو کۆ دەکرێتەوە چل شەوو ڕۆژ. (بۆخاتری نفوذی نوطفە لەنێو هەموو دەمارو ئەندامی ئافرەت وە لەپاش حەوت ڕۆژیش بگەڕێتەوە ناو ڕەحەم). پاشان ئەبێ بەخوێنێکی توند چل شەوو چل ڕۆژی تر لەپاشان ئەبێ بەزار جووە گۆشتێک چل شەوو چل ڕۆژیتر (بەم تەرزە خودا لەم مودەیە پێشان جیگەر ایجاد دەکا پاشان دڵ پاشان مێشک پاشان ئەندامەکانی تری لەش) لەپاشان خودای گەورە یەکێک لەمەلائکە دەنێری فەرمانی پێ دەکرێ بەنووسینی چوار کلمە (ووشە). بەم تەرزە پێی دەگوترێ بنووسە هەرچی کارێکی لەدونیا دەیکا لەچاکەو خراپە بنووسە هەرچی ڕزقێکی کە لەدونیا پێی دەدرێ. لەخواردن و خواردنەوەو پۆشین و زانست بۆکەلک وەرگرتن و شتی تریش). و ماوەی ژیانیشی هەرچەندی بێ (کەمبی یان زۆر). وەپێشی دەگوترێ بنووسە. بەگوێرەی ئەوەی بۆ داندراوە کە لەوانەیە بەختەوەربی یان ناکام. لەپاش نووسینی ئەم چوار کلمانەو تەواوی وێنەی ئنجا ڕووحی دەخرێتە بەربەدەن. [ئەگەر بگوترێ حیکمەت چی‌یە لەگۆڕانی ئینسان بۆ ئەم هەموو حالآنە؟. خۆ خودا پێی دەکرێ بەیەکجار دروستی بکاو بێتە دونیا بەیەک چاو کوتان. دەڵێین لەبەر چەند سوودێکە. یەکێک لەسوودەکان ئەمەیە، ئەگەر بەیەک جار دروست

بکرێ دایکی تووشی ناخۆشیەکی زۆر دەبێ. ئینجا پێشان ئەیکا بە نوطفە تازەمانێک عادەتی پێوە بگری پاشان بەخوێن تازەمانێکیش ئەوی بۆ ببی بەعادەت پاشان ئەیکا بەگۆشتو ئەندام بێ ئەزیەت و ئازار. یەکێکی تریش بۆ بەدیارخستنی تەواوی تەوانایی خۆیەتی بەم تەرزە لەنەبوون ئاوێکی ایجاد بکا لەپاشان ئاو بکا بەخوێن خوێن بکا بەگۆشتو ئەندام لەپاشان لەم ئەساسە زەعیفانە لەسەر چاکترینی وێنەو -صورەت- مرۆڤێکی لێ وەشاوەو ڕازایەوە بەچەند خشلی عەقل و زانیاری و هۆش و هەست بینێتە کایە. ڕێ پێشان دانێکی باشە بۆ تێگەیاندنی عالەم کەسێک بتوانی ئەمە بکا ئەتوانی دووبارە عالەم زیندووش بکاتەوە. ئنجا بەڕاستی پیاو هەیە لەئێوە لەحەیاتی خۆی خواپەرستی دەکا هەتا بەینی لەگەڵ بەهەشت یەک گەز دەمێنێ «ئەگەر فەرز بکرێ بەهەشت جێگایەکە لەعارد) کاغەزە نووسراوەکەی نێو زگی دایکی لەلایەن مەلائکە زوو دەی گاتێ یەعنی بەپێش دەکەوی لێ ناگەڕێ بگاتە بەهەشت». دەست بەکردەوەی ئەهلی ئاگر دەکاو دەچیتە ناو ئاگر پیاویش هەیە لەئێوە لەژیانی خۆی هەر کردەوەی ئەهلی ئاگر دەکا. تا بەینی لەگەڵ ئاگر یەک گەز دەمینێ (ئەگەر فەرز بکرێ دووزەخ لەعاردێکی دونیایە). پاشان کاغەزەکەی نووسراو لەلایەن مەلائکە ئەکەوێتە پێشی ئەی گێڕێتەوە بۆ خواپەرستی کردەوەی ئەهلی بەهەشت دەکا. دەچیتە ناو بەهەشت.

(ش): ئنجا لەم حەدیثە وازاندرا- اعتبار لەئاخری کار بەئەوەلی کارە بۆیێ حەزرەتی عەلی فەرموویەتی (الناس یخافون من الخاتمة وانا اخاف مِنَ الفاتحة). بەلام لەبەر ئەمە کەهیچت لێ دیارنی‌یە کە دوایی کارت چی‌یە، نابێ بەگوێرەی ئەم حەدیثەی دەلێ (علیکم بدین العجائز) واتە ئاینی ئیسلام بەتوندی بگرن بێ جەدەل و موناقەشە هەروەکو پیرێژنان گرتوویانە. نابی دەستی خۆت لەکردەوەی باش شل بکەی بەلکو هەردەبی لەخراپە دوورکەویەوەو بەگوێرەی فەرمانی شەرع بجوولێیەوە. هەروەکو شێخ فریدالدین عطار فەرموویەتی: بەهەلبەستی فارسی:

[رستم از این حدیث شده زیر چادری
پس چون زنان روی بدیوار امده]

٨٠٥: عَنْ اَبي هريرةَ (ض) اذا أحبَّ اللّهُ العبْدَ نادى جبريلَ اِن اللّهَ يحِبُّ فلاناً فاَحبِبْهُ فيحَبُّهُ جبريلُ فينادي جبريلُ في اَهلِ السَّماءِ. انَّ اللّهَ يحِبُّ فلاناً فاَحِبّوهُ فيحبُّهُ اهلُ السماءِ ثمَّ يوضَعُ لَهُ القبُولُ في الارضِ.

## تەرجەمە

٨٠٥: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو خودا بەندەی خۆش ویست بانگی جوبرائیل دەکا بەڕاستی خوداْ فلان بەندەی خۆش ویست تۆش خۆشت بوێ. ئنجا جوبرائیل خۆشی دەوێ پاشان جوبرائیل بانگ دەکا لەنێو ئەوانەی لەئاسمانن بەڕاستی خودا فلانی خۆش دەوێ. ئێوەش هەمووتان خۆشتان بوێ. ئنجا ئەهلی ئاسمانیش خۆشیان دەوێ ئێوەش هەمووتان خۆشتان بوێ. ئنجا ئەوانەی لەئاسمانن خۆشیان دەوێ. ئنجا لەعاردیش خۆشیاندەوێ. لەم حەدیثە پیرۆزە بەدیارکەوت تاخودا خۆش ویستنی نەبێ بەندەش خۆشویستنی نابێ. هەروەکوو لەئایەتیش خۆشویستنی خودا لەپێش خۆش ویستنی بەندەیە (يُحِبُّهم وَيحبُّونَه) واتە خودا خۆشی دەوێن ئەوانیش کەخەڵکە خوشیاندەوێ).

یا خوداد لەمیهرەبانی خۆت بێ بەشمان نەکەی (امین).

٨٠٦: عَن عائشةَ: اِنَّ الملائكةَ تَنْزِلُ في العَنانِ وَهُوَ السَّحابُ فَتَذْكُرُ الأَمْرَ قُضِيَ في السَّماءِ فَتَستَرِقُ الشياطينُ السَّمعَ فَتَسْمَعهُ. فتوحيهِ اِلى الكُهّان فَيكْذُبونُ مَعها مائةَ كذْبَةٍ مِن عندِ اَنفسِهِمْ.

## تەرجەمە

٨٠٦: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی مەلائکە دێنە خوارێ لەناو هەور باسی ئەو کاروبارانە دەکەن لەو ڕووداوانەی کە بڕاوەتەوەو کە دەبێ ببێ. ئنجا شەیتانەکان بەدزی قسەکانیان لێ دەرفێنن ئنجا لەوان دەبیستن پاشان دەخەنە ناو دلی کاهنان (کاهن ئەو کەسەیە کە خەبەری لەوشتە دەدا کە هێشتا ڕووی نەداوە بێ ئەوەی بەلگەیەکی ڕەوای هەبێ) پاشان کاهنەکانیش لەگەڵ ئەو قسانەی گێڕیان لێ بووە سەد درۆ دەکەن لەخۆیانەوە. قسەی بێ بەلگەو دەلیلیش باڕاستیش دەربچی درۆیە چونکی لەسەر ئەساس و زانین نەکراوە (کاری پێ ناکرێ).

٨٠٧: عَن أَبي هُرَيْرَةَ (ض) اِذا كـانَ يومُ الجـمـعَـةِ كـان على كُلِّ بابٍ مِن أبواب المسجد ملائكةٌ يكتبونَ الأوّلَ فالأوّلَ فاذا جَلَسَ الامامُ طوَوا الصُّحُفَ وجاءوا يَستَمِعونَ الذِّكرَ.

### تەرجەمە

٨٠٧: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ‌بی. پێغەمبەر (د) فەرموویتی وەکو ڕۆژی جومعە داهات لەهەر دەرگەیەک لەدەرگەکانی مزگەوت چەند مەلائکە هەیە یەک لەپێش یەک ناوی ئەو کەسانە دەنووسن کەبۆ نوێژ دێنە مزگەوت. پاشان وەکوو ئیمام لەسەر مینبەر دانیشت. ئەو دەفتەرانەی کەناوی ئەوکەسانەی تیا نووسرابوو کە زوو هاتوونە مزگەوت دەپێچنەوە وەلوولیان دەدەن دێنە مزگەوت گوێ لە خوطبە ڕادەگرن.

٨٠٨: عَنِ البراءِ (ض) اهجُهُمْ او هاجِهِمْ وجِبرِيلُ مَعَكَ.

### تەرجەمە

٨٠٨: دەگێڕنەوە لەبەرائی کوڕی عازب ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر فەرمانی بەحەسانی کوڕی ثابت کرد وەکوو کافرەکانی مەککە هەجویان کردبوو (واتە جنێویان پێ دابوو بەهەلبەست) تۆش هەجویان بکە (واتە جنیویان پێ بدە بەهەلبەست) یاخۆ فەرمووی لەبەرامبەر جنیوی ئەوان بەهەلبەست تۆش جنیویان پێ بدەوە بەهەلبەست).
حەزرەتی جوبرائیلیش بۆ یاریدە لەگەڵت دایە.
لەم حەدیثە پیروزە دروستە هەجوی ئەو کافرانەی لەژێر عەهدو ئەمان نەبن دروستیشە شیعر خوێندنەوە لەمزگەوت بەلام دروست نی‌یە تۆ یەکەمجار هەجویان بکەی لەبەر ئایەتی. [وَلاتسبّو الذينَ يدعونَ فيسبّو اللّهَ عَدْواً بغيرِ علمٍ].

٨٠٩: عَن عائشةَ (ض) يا عائشةُ هذا جبريلُ يَقْرأُ عَلَيْكِ السَّلامَ فقالَتْ وعَلَيْهِ السلامُ وَرَحمةُ اللّهِ وَبَركاتُهُ ترى مالا أرى.

### تەرجەمە

٨٠٩: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ‌بی. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی ئەی عائشە ئەمە جوبرائیلە سەلامت لێ دەکا گوتی منیش گوتم سەلام لەسەر ئەویێ وە ڕەحمەتی خوداو بەرەکاتی خودا تۆ دەبینی ئەوکەسەی من نای بینم.
(ش) لەم فەرموودەی پێغەمبەرە وازاندرا. کەدیتن حالەتێکە خوا دروستی دەکا لەزیندوو. لازم ناکا بۆ دیتن ئامادە بوونی دیتراو مەرجەکانی دیتن.
هەروەکوو لازم ناکا لەنەبوونی مەرجەکانی دیتن نەدیتن. چونکی بەایجادی خودایە دیتن

هیچ تەئسیریکی نی‌یە بۆ مەرجەکانی دیتن هەتا دیتن ڕوویدات. ئەگەر تەئسیریک بۆ ئەوان هەبوایە. ئەبوایە حەزرەتی عائشە بی بینی لەبەر هەبوونی دیتراوو مەرجەکانی.

ئەگەر بگوترێ جوبرائیل لەبەرچی بەرەو ڕووی عائشە نەبوو هەروەکوو بەروە ڕووی حەزرەتی مەریەم بوو. دەڵێن لەبەر پاراستنی وریزگرتنی مەقامی پێغەمبەر (د). لای هەندێکانیش مەریەم پێغەمبەر بووە. بۆ پێغەمبەرانیش مانع نیە بۆ دیتن.

**٨١٠: عَن ابن عباس (ض) قالَ قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم لجبريلَ. ألا تزورُنا اكثر مِّما تزورُنا. قالَ فنزلَتْ. ومانتنزلُ اِلاّ بأمْرِ رَبِّكَ له مابيْنَ أيدينا وماخَلْفَنا الآيةَ.**

### تەرجەمە

٨١٠: دگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خودای لێ‌بی. گوتی پێغەمبەر (د) ڕاستەوخۆ بەجبرائیلی گۆت لەم هاتنانەی کە هەتا ئێستا هاتوویە لامان بۆچی زیاتر نایەی بۆ لامان. ئەم ئایەتە هاتە خوارێ مەعنای ئەمەیە ئێمە نایەینە خوارێ کات لەپاش کات. مەگەر هەر بەفەرمانی بەخێوکەری تۆ دێینە خوارێ. کە هەرچی ئێمە تێداین لەجێگاو زەمان دروست کراوو ملکی ئەوە یەعنی پێمان ناکرێ لەجێگایەک بچینە جێگایەک یالە زەمانێک بچینە زەمانێک وە لەزەمانێکیش نەچین ئەگەر بەفەرمانی ئەو نەبێ.

**٨١١: عَنْ ابنِ عباس (ض). اقْرَ أَني جبريلُ على حَرْفٍ فَلَمْ ازَلْ استزيده حتّى إنتهى الى سبعةِ أحرُفٍ.**

### تەرجەمە

٨١١: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عباس ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی جوبرائیل قورئانی بەمن خوێند لەسەر یەک زمان وە لەسەر یەک شێوە لەئەعراب منیش هەر داوای زیاترم لێ کرد لەسەر ئەم یەک زمانە وەیەک شێوەیە بۆ خاتری فرەوان کردن و سووک کردن جوبرائیلیش پرسیاری لەخودا دەکرد کە شێوەی خوێندنی قورئان زیاد بکا (بێ تناقض تضاد) واتا (بێ ئەوەی ئایەتەکان نەگەنە یەکتری) هەتا وای لێهات شێوەی خوێندنی قورئان لەسەر حەوت شێوە بڕیاری لەسەر درا کە بە (قراءات السبع) ناوبراوە کە ئەمانەش شێوەی قسەکردنی -تەمیم و قورەیش و جنە و کنانە و قەیس و هوزەیل و بەنی ئەسەد) بوون.

٨١٢: عن عائشة (ض) لقد لقيتُ مِن قَومِك مالقيتُ وكانَ أشَدُّ مالقيتُ مِنْهُم يَومَ العقبةِ إذ عَرضْتُ نفسي على ابنِ عبْدِ ياليلَ بن عبد كُلال فَلم يُجِبْني إلى ماأرَدْتُ فانطَلَقْتُ وأنا مَهْمومٌ على وَجْهي فَلَمْ أستَفِقْ إلاّ وانا بِقَرْنِ الثَّعالِبِ فرفَعْتُ رأسي فاذا انا بِسَحابَةٍ قد أظلَّتني فنظَرْتُ فاذاً فيها جبريلُ فناداني فقالَ إنَّ اللّه قد سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ وَما رَدّوا بِهِ عَلَيْكَ وَقَدْ بَعَثَ إلَيكَ مَلَكَ الجِبالِ لِتَأمُرَه بِما شِئْتُ فيهِمْ. فناداني مَلَكُ الجبالِ فَسلَّمَ عَلَيَّ ثمَّ قالَ يامحمدُ فقالَ ذلِكَ فما شِئْتَ. إن شِئتَ أن أطبِقَ عَلَيْهِمُ الأخشَبَينِ. فقالَ النبي صلى الله تعالى عليه وسلم بَلْ أرْجَو أنْ يُخرِجَ اللّهُ مِن أصلابِهِمْ مَن يعبُدُ اللّهَ وَحْدَهُ لايُشرِكُ به شَيْئاً.

## تەرجەمە

٨١٢: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە -ڕەزای خودای لێ بی گوتی بەپێغەمبەری گوت (د) هیچ ئەحوالێکت بەسەرهاتووە لەئەحوالی ڕۆژی ئوحود سەخت تر فەرمووی بەڕاستی تووشبووم لەلایەن قەومی تۆ کە قوڕەیشە. ئەو موصیبەتی کە تووشبووم - سەخت ترینی هەموو ئەزیەتانو عەزابان ئەم ئەحوالەبوو کە لەڕۆژی عەقەبە تووش هاتم- (عەقەبە جێگایەکی تایبەتە لە طائف). وە لەسالی دەیەمی پێغەمبەرایەتیم لەمانگی شەوال لەپاش وەفاتی ئەبو طالب و خەدیجە لەبەر تەنگەتاو کردنی قوڕەیشی مەککە بۆ من لەنیشاندانی خۆم). ڕووم لەطائف کرد بۆلای کوڕی عبد یالیل (کە یەکێک بوو لەگەورەکانی طائف لەثەقیف ناوی کنانەبوو). لەهیچ بارەیەک مەبەستی منیان جێ بەجێ نەکرد. چونکی پێغەمبەر (د) بۆیێ بۆ طائف چوو کەبی حەوێننەوە لەچەنگ قوڕەیش بحەسێتەوە. ئنجا بۆلای سێ کوڕەکانی عەمری کوڕی عومەیری کوڕی عەوف چوو. کە عبدیالیل و حەبیب و مەسعود بوون. شکایەتی خۆی لەدەست قوڕەیش لەلاکردن. کە ڕێزم ناگرن حقوقی خزمایەتی ناپارێزن، ئنجا هاتوومە لای ئێوە کە ئێوە پارێزگاری حقوقم بکەن لەپاش ئەم فەرمایشانەی کوڕەکانی عەمر وەخەلکی طائف بە ناخۆشترین و ناشیرین ترین شێوە وەلامیان دامەوە. هەتا کەوتنە شوێنی بەبەردان هەردوو قاچی پیرۆزیان بەخوێندا هینا. بەلکی حسین هیکل لەدانراوی خۆی (حیاة محمد) دەلێ منال و نەزانانی طائفیان خستە شوێن. بەجنێو پێدان و بەرد لێدان. بەغاردان و ڕاکردن خۆی گەیاندە پەنای دیوارێکی عوتبەو شەیبەی دوو کوڕی ڕەبیعە خۆی لەوی پەنای دا منداڵە بێ عەقلەکان گەڕانەوە. ئەویش لەژێر سێبەری دارمێوێک دانیشت دوو کوڕی ڕەبیعەش تەماشایان دەکرد. کە کەوتە چە سەختیەکەو عەزابێک و زەبوونی‌یەک. وەکوو نەختێ لەبن دیوارەکە

حەسایەوە. سەری بڵندکرد بۆ ئاسمان لەبەر ئێش و ئازاری قالبی خۆی. فەرمووی ئەی خودای من. من شکایەتی بێ هێزیو بێ چارەیی خۆم هەر دێنمە بەرتۆ ئەی لەهەموو کەس میهرەبان تر. تۆ خودای زەعیفانی تۆ خودای منی. کاروباری من بەکێ دەسپێری بەیەکێک دەسپێری کە رووی خۆی لەمن گرژ بکا. یاخۆ بەدوژمنێک دەسپێری کە کاروباری منت خستیتە ژێر دەسەڵاتی ئەو. خۆ ئەگەر لەتۆدا نەبی رق بوونەوەت لەمن. گوێ نادەمە هەر شتێکی بەسەرم بێ بەڵام میهرەبانی تۆ فرەوانترە بۆ من، ئیتر بەم تەرزە ماوەیەک پاڕاوە لەبەرخودا. دووکوڕی رەبیعەش تەماشایان دەکرد دڵیان پێ سووتا. هێشووە ترێ یەکیان دا بەندەکەی خۆیان کە ناوی (عەدداس) بوو بیداتە پێغەمبەر (د) کە لەبن دیوارەکە دانیشتبوو دەستی پیرۆزی گەیاندە ترێیەکە فەرمووی بسم الله پاشان خواردی. (عەدداس) لەم قسەیە سەری سوڕما گوتی ئەمە قسەیەکە خەڵکی ئەم وولاتە نایکا پێغەمبەر (د) فەرمووی خەڵکی کوێی؟. گوتی خەڵکی نەینەوام دیانم. فەرمووی تۆ خەڵکی دێیەکەی یونسی کوڕی مەتای. (عەداس) گوتی تۆ چۆن دەزانی یونسی کوڕی مەتا کێیە. فەرمووی برای منە، پێغەمبەر بوو منیش پێغەمبەرم عەدداس خۆی پێ ڕانەگیرا غاریدا دەستو قاچو سەری پیرۆزی ماچ کرد دوو کوڕی رەبیعەش چاویان پێکەوت کە عەدداس چی کرد سەریان سوڕما. وەکوو عەدداس گەڕاوە لایان گوتیان ئەی عەدداس دینی خۆت باشترە بەقسەی ئەمە فەریب نەخۆی ئنجا لەپاش ئەمە کە خەڵکی طائفیش رەدیان کردەوە ئازاریان دا. فەرمووی نەمزانی ڕوو لەکێ بکەم. لەبەر غەمناکی خۆم وەکوو سەر سوڕماوو ڕێ لێ بزربووم لێ هات. بەسەر گەشتەیی هەلستام ڕۆیشتم نازانم بۆ کوێ دەچم. کاتێک هۆشم هاتەوە بەرەخۆم لەسەر جێگایەکم پێی دەڵێن (قرن الثعالب) کە میقاتی خەڵکی نەجدە. دیتی بەینی لەگەڵ مەککە یەک شەوو ڕۆژە. سەرم بڵند کرد دیتم پەڵە هەورێک سێبەری لێ کردووم. وەکوو تەماشام کرد جویرائیلی تیابوو. بانگی کردم گوتی ئەی محمد ئەو قسەی جویرائیل دەڵێ ڕاستە ئنجا فەرمانت لەسەر چییە؟ هەتا وابکەم. ئەگەر حەزدەکەی کێوی ئەبو قوبەیس و کێوی قەیقەعان کە لەلای باکوورو باشووری مەککە بوو لەبەرامبەر یەکترین بەسەریاندا دەڕووخێنم لەبندا بمێن. پێغەمبەر (د) فەرمووی نا من واحەزناکەم. بەڵکی تکا لەخودا دەکەم عالەمێک لەپشتی ئەمانە پەیدا بکا تەنیا خودا بپەرستێ هیچ شتێک نەگێڕن بەهاوبەش بۆ خودا. ئنجا بەڕاستی ئەم ڕووداوە لەڕووداوی ئوحود سەخت تر بوو چونکی لەم ڕووداوە لەگەڵ ئەم هەموو ئازارو ناخۆشیەی کە تووشبوو تەنیا (زەید کوڕی حارثە)ی لەگەڵدا بوو. لەڕووداوی ئوحود هەموو ئەصحابی لەگەڵ دابوو. بەربەرەکانێی دوژمنیشیان هەرکرد.

هەتا کوشتاریش تەواوبوو. ئەنجامیش کشانەوەی لەشکری کافران بوو. «مەبەست لەئەخشەبەین، لەحەدیث کێوی ابو قوبەیس و قەیقەعانە. لەبەر سەختیان پێ ی دەڵێن ئەخشەبەین».

٨١٣: عَنْ أَبي هُرَيْرةَ (ض) إذا دعا الرَّجُلُ إمرَأتَهُ الى فراشِهِ فأبَت فباتَ غضبانَ عليها لعنتها الملائكةُ حتّى تُصبِحَ.

**تەرجەمە**

٨١٣: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو پیاو بانگی ژنی خۆی بکا بۆ سەرجێگاو ڕایەخی خۆی پاشان ژنەکەش نەیەلی ئنجا پیاوەکە ئەو شەوە بەڕق بوونەوە بمینێ مەلائکە لەعنەت لەو ژنە دەکەن هەتا کاتی سبەینە.
(ش): بانگ کردنی پیاو لێرە کنایەتە لە جووت بوون (جماع) گوتنی (حتی تصبح) ئەگەرچی بانگ کردن تەخصیصی دەکا بەشەو بەلام ڕۆژیش لەحوکمی ئەم لەعنەتە وەکوو شەوە بەلام چونکی جووت بوون بەزۆری لەشەودایە بۆیێ لەحەدیث شەو گوتراوە.

٨١٤: عَن ابن عباس (ض) رايتُ لَيْلَةَ أُسرِيَ بي موسى رَجُلاً ادَمَ طوُالاً جَعْداً كأنَّهُ مِن رجالِ شَنُوءَةَ. ورأيْتُ عيسى رجُلاً مَربوعاً مَربوعَ الخَلْقِ الى الحُمرةِ والبياضِ سَبَطَ الراسِ ورأيْتُ مالِكاً خازِنَ النّارِ والدّجّالَ في اياتٍ أراهُنَّ اللهَ إيّاهُ فلاتكُن في مريَةٍ مِنْ لقائِه.

**تەرجەمە**

٨١٤: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی شەوی میعراج کە شەو ڕۆم پێ کرا بۆ (مسجد الاقصی) موسام دیت سەلامی خوای لێ بی پیاوێکی ڕەنگ ئەسمەرو بالادرێژ بوو پرچی بەگلوازە بوو گۆیا لەپیاوەکانی شنو ئەبوو «کە قەبیلەیەکە لەقەحطان بالابەرزن». چاوم بەعیساش کەوت سەلامی خوای لێ بی پیاوێکی ناوەنجی بوو نەکورت بوو نەدرێژ بوو لەگەڵ ئەم ناوەنجی‌یەش ڕەنگی مەیلەو سۆروسپی بوو مووشی بەگولوازە نەبوو. مالکم دیت کە دەرگەوانی ئاگرەو دەجالیشم دیت. لەهەندێ نیشانەی تر خودای گەورە ئەم نیشانانەی پیشانی پێغەمبەر دا. ئنجا لەشکدامەبە لەگەیشتن بە موسی (سەلامی خوای لێ بی) ئەی محمد.

٨١٥: عَن ابن عمر (ض) إذا ماتَ أحَدكم يُعرَضُ عَلَيْهِ مَقعَدُهُ بالغُدوَةِ والعَشيِّ فان كانَ مِنْ أهلِ الجنّةِ فمِنْ أهْل الجنّةِ وإنْ كانَ مِن أهْل النارِ فَمِن أهْلِ النار.

## تەرجەمە

٨١٥: دەگێرنەوە لەعبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی. وەکو یەکێک لەئێوە مرد نیشانی دەدرێ جێگای خۆی لەهەموو سبەینەو ئێوارەیەک. ئنجا ئەگەر جێگایەکەی نیشاندراو لەجێگایانی ئەهلی بەهەشت بی مردووەکەش ئەهلی بەهەشتە. ئەگەر لەجێگایانی ئەهلی ئاگربی مردووەکەش ئەهلی ئاگرە.

(دانەری ئەم پەرتووکەش ئەلێ:

ئنجا ئەگەر مردووەکە لەکۆمەلی یەکەم بی ئەوە گۆڕەکە بۆ ئەو بەهەشتە. چونکی لەم بەرزەخەی لەگەڵ هەبوونی حەسانەوەی هەموو ئێوارەو سبەینەیەک. خۆشیەکانی کە پەیوەندی بەئەوە لە کۆشکو بالاخانە بەئەو نیشان دەدرێ. گۆیا هەرکات لەبەهەشتِ دایە. ئەگەر کۆمەلی دووەمیش بێ. گۆڕ بۆ ئەو ئاگرە. بەبەلگەی ئەم حەدیثەی کە دەلێ: (القبرُ إما روضَةٌ من رياض الجنان او حفرة من حفر النيران) لەم حەدیثە زاندرا ڕەوضە -واتە باخچەی خۆش و گەورە یان حفرە -واتە قۆرتی دووزەخ ئەمە لەقیامەتە لەبەرزەخ نی‌یە.

مەبەست لەبەرزەخ: واتە لەوکاتەی دەمری هەتا زیندوو دەکرێتەوە بۆ حساب و جەزا ئەو ماوەیە پێ‌ی دەلێن بەرزەخ.

ئنجا بۆ خاتری ئەوەی بگەنەوە یەکتری و (منافاة) نەبی لەبەینی ئەم دوو حەدیثە ئەمەم نووسی: چونکی لەشروحی بوخاری هیچم نەدیت لەخۆمەوە ئەو ڕیک خستنەم نووسی ئەگەر نوقصانیش هەبی خودای گەورە لێ بووردنی زۆرە.

٨١٦: عَن عمران ابن حُصَيْن. إطّلَعْتُ في الجنّةِ فَرَأيْتُ اكثرُ أهْلِها الفُقَراءَ. واطّلَعْتُ في النّارِ فَرَأيتُ اكثر أهْلِها النِّساءَ.

## تەرجەمە

٨١٦: دەگێرنەوە لە عمرانی کوری حوصێن ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر (د) فەرمووی شەوی میعراج سەیری بەهەشتم کرد دیتم زۆرترین ئەوانەی لەبەهشتن هەژارەکانی نیماندار بوون. سەیری ئاگریشم کرد دیتم زۆرترینی ئەوانەی لەئاگربوون ئافرەت بوون.

٨١٧: عَن اَبي هُرَيْرَةَ (ض) بَيْنا انا نائِمٌ رأيتُني في الجَنَّةِ. فاذا إمرَأةٌ تتوضَأُ الى جانبِ قَصْرٍ فَقُلْتُ لِمَنْ هَذا القَصْرُ فقالوا لعمر ابنِ الخَطابِ فذكرتُ غيرَتَهُ فولَّيْتُ مدبراً. فبكى عُمَرَ. وَقَالَ اَعلَيْكَ اغارُ يارسولَ اللّهِ.

## تەرجەمە

٨١٧: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی ئێمە لەخدمەت پێغەمبەر بووین. لەناکاو فەرمووی وەقتێک خەوتبووم. خۆم لەبەهەشت دیت لەناکاو ژنیکم چاو پێکەوت. لەتەنیشت قەسرێک دەست نوێژی دەشووشت. منیش پرسیم. ئەمە قەسری کێیە. گوتیان هی عومەری کوڕی خەطابە. منیش غیرەتی عومەرم کەوتەوە یاد پشتم لەقەسرەکە کردو ڕۆیشتم حەزرەتی عومەر دەستی بەگریان کردو گوتی: غیرەت نواندنم دەرحەق بەتۆش چما ممکنە ئەی پێغەمبەری خودا (یەعنی ممکن نی‌یە).

٨١٨: عَن اَبي هريرَةَ. اَولُ زُمرَةٍ تِلِجُ الجنَّةَ صورتُهُمْ على صورَةِ القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ لايَبْصقُونَ فيها ولايَمتَخِطونَ وَلايَتَغوَّطونَ آنيتهُمْ فيها الذَّهَبُ اَمْشاطهُمْ مِن الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ ومجامِرهُم الاَلُوَّةُ وَرَشْحُهُمْ المِسكُ وَلِكلٍ واحِدٍمِنْهُم زوجَتان يُرى مُخُّ سوقِهما من وراء اللَّحْمِ مِن الحُسْنِ. لا إختلافَ بَينَهُم ولا تباغُضَ. قلوبُهُمْ قَلْبٌ واحِدٌ يُسبِّحونَ اللّهَ بُكرةً وَعَشِيّاً.

## تەرجەمە

٨١٨: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێبی. گوتی پێغەمبەر (د) فەرموی یەکەم جەماعەت کە دەچنە بەهەشت شێوەیان وەکو مانگی چواردە شەوەیە. تف ڕوناکەن لەبەهەشت. چلم و بەلغەم ڕووناکەن پیسایی بەدامەن ناکەن (یەعنی لەصفاتی کەمی -نەقصی- پاکن) قاپ و قاچاغیان لەزێڕە. شەیان لەزێڕە (شەکردنیان لەبەر چلکو قرێژێک نی‌یە کە لەمووەیاندا هەبی چونکی دایما پاکن). مەقەڵەی بخوریان لە (ئەلەوەیە) کە دارێکە لەهندستان، بێنی زۆر خۆشە).

ئەگەر بگوترێ ئاگر لەبەهەشت نی‌یە چلۆن بەچی بخور دەسوتێن. دەلێین ئاگرێکی تیایە تەنیا بۆ بوخور سوتاندنە). ئارەقەشیان لەبێن وەکوو مسکە. بۆ هەریکەیان دوونافرەتی دونیا هەیە (بەلام لەئەبی ئیمامە ریوایەت کراوە پێغەمبەر (د) فەرمووی لای کەمی هەر یەکێک لەوانەی لەبەهەشتن حەفتاو دوو ژنی هەیە دوویان (حورالعین)ە.

حەفتاشیان لەمیرات گرانی خۆیتی لەئەهلی دونیا. لە عبداللەی کوڕی ئەبی ئەوفا بەمەرفوعی ریوایەت کراوە. بەڕاستی هەر پیاوێک لەوانەی لەبەهەشتن لەحوریانیش پێنج سەد مارە دەکا چوار هەزار کچ و هەشت هەزار بێوەژن مارەدەکا بەمقداری تەمەنی خۆی لەدونیا. دەست لەملانی لەگەڵ هەریەکەکیان دەکا). دەبینرێ لەبەر جوانی مێشکی لوولاقیان لەبن گۆشت و ناو ئێسقان. لەبەر پاکی دلیان هیچ ناڕێکی و ڕک لێ بوونەوە لەبەینی ئەهلی بەهەشت نیە. دلی هەموویان لەبەر یەک بوونیان وەکوو یەک دلە تەسبیحاتی خودا دەکەن بۆ خۆشی وەرگرتن نەک بۆ خواپەرستی (تەعەبود) هەموو سبەینەو ئێوارە..

[ممکنە مەبەست و موراد لەبێوەژن بوونە لەبەر -وجعلناهن ابکارا- بکری جەعلیش هەیە- واتە بێوژنێک کە خودا بەئیرادەی خۆی دەی گێڕی بەکچ لەبەهەشت. بێوەژن لەبەهەشت نی‌یە].

٨١٩: عَنْ سَهْل ابْنِ سَعد (ض) لَيَدْخُلَنَّ مِنْ أُمَتي سبعونَ الفاً او سَبعُمائَةَ الفٍ لايدخُلُ اولُهُم حتّى يَدْخُلَ اخِرُهُم وُجوهُهُمْ على صورَةِ القَمَرِ.

### تەرجەمە

٨١٩: دەگێڕنەوە لەسەهلی کوڕی سەعد ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی بێ شکو گومان لەئومەتی من هەفتا هەزار یان حەفت سەد هەزار دەچنە ناو بەهەشت یەکەم کەس و دواکەس بەیەکەوە دەچنە بەهەشت «یەعنی سەرەتاو دوایی‌یان دەکرێنە یەک ڕێز هەموو بەیەکجار دەچنە بەهەشت». ڕوویی ئەوانیش لەسەر شکل و شێوەی مانگی چواردەشەوەیە. لەحەدیث -ژمراو باس نەکراوە- ئنجا لەوانەیە ژمراوکەس (شەخص) بێ یەعنی حەفتا هەزار کەس دەچنە بەهەشت. یا لەوانەیە ژمراو فیرقەبێ یا جەماعەت بێ. بەلکی لەوانەیە ملیون بێ یان علیار بێ. وە ئەم حەدیثە دەرحەق بەوانە هاتووە کەبەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت ئنجا هەر خودا خۆی دەزانی ژمراو لەوان چەندە. (ئەگەر نووسەرو تەماشاکەری ئەم کتابەیش لەوانبی هیچ لەخەزینەی خودا کەم نابی).

٨٢٠: عَن أنسٍ (ض) والّذي نفسُ مُحَمَّدٍ بيَدهِ لَمناديلُ سَعدِ ابنِ مُعاذٍ في الجنَّةِ أحسَنُ مِنْ هذا.

## تەرجەمە

٨٢٠: دەگێڕنەوە لەئەنەس -ڕەزای خودای لێ بی- گوتی لەلایەن -ئەکیدری کوڕی ڕۆما - جوبەیەکی سوندسی بەدیاری بۆ پێغەمبەر (د) ڕەوانەکرا. یەعنی جوبەیەکی ئەستوور لەئارمووشی تەواو وەبەڕەونەق بەدیاری ڕەوانەکرا زینەت و جوانی جوبەکە خەلکی سەریان لێ سوڕدەما. پێغەمبەر (د) فەرمووی. سوێندم بەوزاتەی کە ڕووحی محمدی بەدەستە. دەستەسڕەکانی سەعدی کوڕی مەعاذ لەبەهەشت لەم جوبەیە جوانترە.

(ش): خطابی گوتیتی بۆ زیاد لەهەموو جلکی بەهەشت دەستەسڕی فەرموە چونکی لەکەمترین جلکانە بەم تەرزە دەستی پێ پاک دەکەنەوە لەچلکو چەوری. تف و بەلغەمی لێ ڕوو دەکرێ چلکی پێ پاک دەکرێتەوە لەتۆزو شتی تریش یەعنی ئەی ئومەتی من بزانن. کە دەستەسڕی بەهەشت جوانتربی لەم جوبەیە ئەبێ جلکی سەر بەدەن لەنەزاکەت و جوانی بەچ دەرجەیەک بێ. ئەی خودای میهرەبان بەچاکەی خۆت بەشمان تێ بخە.

٨٢١: عَن أَبي هريرَة (ض) إنَّ في الجنَّةِ لشَجَرةً يَسيرُ الرّاكِبُ في ظِلِّها مِاَةَ سَنَةٍ واقرءوا إنْ شِئتُم وظِلٍّ ممدودٍ.

## تەرجەمە

٨٢١: دەگێڕنەوە لەئەبو هوڕەیرە ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی دارێک هەیە لەبەهەشت دەڕوا سواری وولاغی ڕەسەن و خۆش ڕۆ لەسێبەری ئەو دارە سەد ساڵ وە ئەگەر حەزیش دەکەن بخوێننەوە لەئایات (وظل ممدود) یەعنی سێبەری دوورو درێژ لەبەهەشت هەیە.

٨٢٢: عَن ابي سعيد الخُدْريِّ (ض) إنَّ أهلَ الجنَّةِ يتراءَيونَ أهلِ الغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِم كَما يَتراءَيونَ الكَوْكَبَ الدُّرِّيَّ الغابِرَ في الأفقِ مِنَ المِشْرقِ أو المَغْربِ لِتَفاضُلِ مابينَهُمْ قالوا يارسولَ اللّهِ تِلْكَ منازِلُ الأنْبياءِ لايبلُغَها غيرُهُم. قالَ بلى والّذي نَفْسي بيَدِهِ رجالٌ آمنوا بِاللّهِ وَصدَّقوا المُرسلين.

## تەرجەمە

٨٢٢: دەگێڕنەوە لەئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خرای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی. ئەوانەی لەبەهەشتن لەسەرەوەی خۆیان تەماشای ئەوانە دەکەن کە لەهەندێ

کۆشکو بالاخانەدان. چلۆن تەماشای ئەستێرەیەکی گەشی مایەوە دەکەن لەپاش بەیان. کە مابیتەوە لەلایەکی ئاسمان لەڕۆژهەلات یا لەڕۆژ ئاوا (یەعنی لەپاش ڕۆناک بوونی دونیاش هەر بزرنەبوویی لەبەر زێدەگەشی خۆی» . لەبەر صفەتێکی باشی زیاد کە لەواندا هەیە. لەهەموو ئەوکەسانە نی‌یە کە لەبەهەشتن ئەصحابەکانی بەڕێز پێ‌یان گوت. ئەی پێغەمبەری خودا. ئەم قەسرە بەرزانە جێگەو مەقامی پێغەمبەرانن غەیری ئەوان هیچ کەس نایگاتێ فەرمووی (با) سوێندم بەو زاتەی کە نەفسی منی بەدەستە ئەو پیاوانە دەگەنێ کەبەڕاستی باوەڕیان هەبوویێ بەخودای گەورە. وە بەڕاستی باوەڕیان کردبێ بەپێغەمبەرانی ناردراو (لای ترمذی فەرمووشی ئەبوبکرو عومەر لەوانن).

٨٢٣: عَنْ عائِشَةَ (ض) الحُمّى مِنْ فَيْحِ جَهنَّمَ فابْرِدوها بِالماءِ.

**تەرجەمە**

٨٢٣: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر (د) فەرمووی تا لەگەرمایی دووزەخە. بۆ نموونە -ناردراوەتە دونیا کە بۆ ئەوانە موژدەدەر بەعەزاب بێ کە باوەڕ نایێن. ئینجا تا سارد بکەنەوە بەئاو «هەر چلۆنی ئاگر بەئاو دەکوژێتەوە».

٨٢٤: عَن اَبي هريرَةَ (ض) نارُكُم جـزءٌ مِن سَبـعينَ جُـزءاً مِنَ نارِ جَـهَنَّمَ قـيلَ يارسولَ اللّه اِن كانَتْ لكافيةً قالَ فُضلَّت عَلَيْهِنَّ بِتِسْعَةٍ وَستينَ جُزءاً كلُّهُنَّ مِثْلُ حرِّها.

**تەرجەمە**

٨٢٤: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئاگری ئێوە کە لەهەموو دونیا دەی سووتێنن گەرمایی‌یەکەی یەک بەشە لەحەفتا جوزئی گەرمایی ئاگری دووزەخ. پێ‌ی گوترا ئەی پێغەمبەری خودا ئەم هەندە گەرمایی‌یە بەس بوو بۆ سووتاندنی کافران. وە ئازاردانی کافران. فەرمووی بەباشتر زاندرا لەسەر ئاگرەکانی دونیا لە فەرمانی خۆی کە سووتاندنە. بەشەست و نۆ بەشی زیاد لەگەرمایی ئاگری دونیا کە هەر بەشێک هەندەی گەرمایی ئاگری دونیایە.

٨٢٥: عَن اُسامَةَ (ض) تُجاءُ بِالرَّجُلِ يَوْمَ القيامَةِ فيلقى في النّارِ فتندَلِقُ اَقْتابُهُ في النّارِ فـيدورُ كما يَدورُ الحِمارُ بِرَحاهُ. فيَجْتَمِعُ اَهْلُ النّارِ عَلَيْه فيقولونَ اَيْ فُلانُ

ماشأنُكَ. ألَيْسَ كُنْتَ تأمرُ بالمَعْروفِ وتَنْهى عَنِ المُنْكَرِ قالَ كنتُ آمُرُكم بالمَعْروفِ ولا آتيهِ وأنْهاكُم عَنِ المُنْكَرِ وَآتيهِ.

## تەرجەمە

٨٢٥: دەگێڕنەوە لەئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حارثە -ڕەزای خودای لێ بی- گوتی بیستم لەپێغەمبەر (د) دەی فەرموو پیاو هەیە دەهێنرێ ڕۆژی قیامەت دەخرێتە نێو ئاگر ناو زگو ریخەلۆکی بەچوستی لەپاشەوەی دێتە دەرێ. دەورەدەداو دەسووڕێ. هەر چلۆنی کەر دەگەڕێ لەدەورەی ئاشو شوێنی سووڕانەوەی خۆی ئنجا ئەوانەی لەئاگرن لێی کۆ دەبنەوە. دەڵێن ئەی فلان بۆچی وات بەسەرهاتووە ئەدی تۆ نەبووی فەرمانت دەکرد بەچاکە دەت گوت خراپە مەکەن. دەڵێ فەرمانم بەئێوە دەکرد بەخۆشم نەم دەکرد. دەشم گوت خراپە مەکەن بەخۆشم دەم کرد.

(ش): ئەمە زەجرێکی گەورەیە بۆ ئەو مەلایانەی. عەمەل بەعیلمی خۆیان نەکەن بەلوطفی خودای گەورە خۆمان دەپارێزین لەم خەسڵەتە پیسەوە لەم عەزابە دژوارە.

٨٢٦: عَن عائشة (ض) أشَعَرْتِ أنَّ اللّٰه أفتاني فيما فيه شِفائي أتاني رَجلانِ فقَعَدَ أحدُهما عندَ راسي والآخَرُ عند رجلَيَّ فقالَ أحدُهما للآخَرِ ماوَجعُ الرَّجُلِ. قالَ مطبوبٌ. قالَ وَمن طَبَّهُ. قالَ لبيد ابنِ الأعصَم. قالَ فيماذا قالَ في مُشطٍ وَمشاقَةٍ وَجفِّ طَلعَةٍ ذكَرٍ قالَ فأيْنَ هُوَ. قالَ في بِئْرِ ذَرْوانَ. فخرَجَ اليها النبيُّ صلى اللّٰه تعالى عليه وسلم. ثم رَجَعَ فقالَ لعائِشةَ حينَ رَجَعَ نخلُها، كأنَّهُ رؤوس الشياطين. فقُلْتُ استخرجْتَهُ. فقالَ لا أمّا أنا فقد شفاني اللّٰهُ وَخشيتُ أن يُثيرَ ذلِكَ على الناسِ شرّاثُمَّ دُفِنَتِ البئرُ.

## تەرجەمە

٨٢٦: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بی. گوتی وەکو پێغەمبەر (د) تەشریفی لەحودەیبە گەڕاوە سحری لێ کرا. هەتا بەغایەتێک دەخرا خەیالی کەشتێک دەکا لەکاروباری دونیا نەشیدەکرد. ئەم حالەتە ساڵێک دەوامی کرد هەتا ڕۆژێک سێ جار دوعای کردو پاڕایەوە لەسەر عادەتی خۆی چونکی عادەتی وابوو. کە دوعای بکردایە چەند جار دووبارەی دەکردەوەو دەپاڕایەوە. پاشان بەحەزرەتی عائشەی فەرموو خودا دوعای قبووڵ کردم. بەم تەرزە خەبەری پێ دام کە شفای من لەچی دایە. فەرمووی

دووپیـاو هاتنه لام (کـه جبـرائیل و مـیکائیل) بوون. جـوبرائیـل لای سـەرم دانیـشت. میکائیلیش لای قاچم دانیشت میکائیل بەجوبرائیلی گوت. ئەساغی ئەم پیاوە چی‌یە؟ جبرائیل گوتی -مەطبوبە-- یەعنی سحری لێ کراوە میکائیل گوتی کێ سیحرو جادووی لێ کـردووە جـوبرائیـل گـوتی لەبیـدی کـوڕی ئەعـصـەمی جـوولەکـە. مـیکائیـل گـوتی. جادووەکەی لەچی لێ کردووە؟ جوبرائیل گوتی لەشەیەک و لەداوە دەزی کەتان و کیسەی بەری دارخورمای ووشکبوویەوەی نێر. میکائیل گوتی ئەمە لەچی جێگاییکە. جوبرائیل گـوتی لەبیـری ئەروانە لەباغی بەنی زورەیقی جـوولەکـە (لەمـەدینە تیـرەیەک بـوون لەجوولەکە) پێغەمبەر (د) وەکوو لەخەو ئەم خەبەرەی لەوان وەرگرت هەلستا چووەلای بیرەکە وەکوو گەڕاوە بەحەزرەتی عائشەی گوت. دارخورمایەکانی باغی بەنی زورەیق کە بیـرەکـەی لەنێـوە. سـەرەکـانیـان دەلێی سـەری ئەو مـارانەیە کـە ناویان (شەیاطینە) لەناشیرینی دیەنیان. حەزرەتی عائشە پێی گوت جادوەکەت هێنا دەرێ. فەرمووی ئەم هینا دەرێ ترسام خراپی و زیانی بلاوبێ لەنێو خەلکی. پاشان بیرەکە بزرکراو پڕکرایەوە.

(ش): دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عومەر ئەویش لەحەزرەتی عائشە گوتی پێغەمبەر (د) لەنێو کیفکە خورمایەکە دیتی هەیکەل و تمثالی ئەویان دروست کردبوو چەند دەرزیەکیان لێ چەقـاندبوو داوە دەزووکـیـشـی تیـابوو. یازدە گرێی لێ درابوو. حەزرەتی جوبرائیل دووسـوورەی مـعـوذەتەین بۆ ناردەخـوارێ. بەهەر ئایەتێک کـە دەی خـوێند گـرێیەک دەکرایەوە. هەر دەرزیەکیش کە دەری دەهێنا ئازارێکو ئیشێک بەپێغەمبەر دەگەیشت پاشان دەحەسایەوە.

لەمەوا زاندرا سیحر تەئسیر دەکا بە ئیزنی خودای گەورە با بەخۆشی هیچ تەئسیری نەبێ. سیحر بریتی‌یە لەداواکردن لەنفوسی پیس بۆ هەندێ گفتارو کردار کەشتی (خارق العـادە) لێ دروست بکا بەداوای یاریدە لەشـەیتـانەکـان. بەلام لەپاش هاتنەخـوارەوەی -معـوذتین- واتە سـوورەی (قل أعـوذ برب النـاس ملك النـاس اله النـاس...) لەگـەلّ سوورەی (قل اعوذ برب الفلق من شر ماخلق ومن شر غاسق اذا وقب... الخ).

سیحرو جادوو هیچ تەئسیرو کـاریگەریەکی نەما بۆ پێغەمبەر (د) تەئسیـری ئەم جارەشی تەنیا عائد بەئەحوال و کاروباری دونیا بوو دەربارەی وەحی و ئەحوالی ئاخیرەتو ئیرشاد بێ موداخەلەو دووربوو لەتەئسیر چونکی هەموو پێغەمبەرێک چی جائی سەرۆکیان کە محمدە (د) بەدەلیلی ئایەتی ئاخری سوورەی جن کە دەفەرموێ. [إلاَّ مَن ارتضی مِن رسولٍ فـانَّهُ یسلُكُ مِن بینِ یَدَیْهِ وَمِن خَلْفِهِ رَصَداً]. لەکاتی وەحیـو تەبلیغ وئرشاد بۆ پارێزگاریان لەشەڕی شەیتانەکان بەهێزێکی گەورە دەورەیان دەگرتن لەپێش و پاش چەپو

ڕاست. ڕادەوەستان هەتا فەرمانی خۆیان بەجێ دەگەیاند کە تەبلیغ و ڕاگەیاندنی وەحیە. [لَيَعْلَمَ اَن قد ابلغوا رسالاتِ رَبِّهم واَحاطَ بِما لَدَيْهِمْ] یەعنی هەتا بتوانن ڕاگەیاندن و ڕابەرایەتی‌یان جێ بەجێ ببێ و بێتە جێ.

٨٢٧: عَن اَبي هريرةَ (ض) ياتي الشيطانُ اَحدكُمْ فيقولُ مَنْ خَلَقَ كَذا مَن خَلَقَ كَذا حَتّى يَقولَ مَن خَلَقَ رَبَّك فاذا بَلَغَهُ فلْيَسْتَعِذْ بِاللّهِ وَلْيَنتهِ.

## تەرجەمە

٨٢٧: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی شەیتان بەخۆی کە ئبلیسە یا یەکێک لەیاریدەدەرانی دێتە لای یەکێکتان ئنجا دەڵێ بەوەسوەسە کێ ئەمەی پێدا کردووە کێ ئەمەی پەیداکردووە هەتا لەدواییدا دەڵێ کێ بەخێوکەری تۆی خەلق کردووە کە خودایە وەکوو گەیشتە ئەمە بڵێ (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) واتە خۆم دەپارێزم بەخودا لە (شەیتان) راببڕێتەوە هیچی تر درێژەی نەداتێ.

٨٢٨: عَن جابر (ض) إذا استُجنَح اللَّيْلُ او كانَ جُنحُ اللَّيلِ فكفّوا صبيانكم فانَّ الشياطِينَ تنتشرُ حينَئِذٍ فاذا ذَهَبَ ساعةٌ مِن العِشاءِ فحلّوهُمْ وَاَغْلِقْ بابَكَ واذكُر اسم اللّهِ وَاَطْفِيءِ مِصْباحَكَ واذكُر اسمَ اللّهِ وَاَوْكِ سِقاءَكَ واذكر اسمَ الله وَخَمِّرْ إناءَكَ واذكر اسمَ اللّهِ وَلَوْ تَعْرِضُ عَلَيْهِ شَيئاً.

## تەرجەمە

٨٢٨: دەگێڕنەوە لەجابر ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی پاش ڕۆژئاوا وەکوو شەو تاریک داهات منداڵتان قەدەغە بکەن لەگەڕان چونکی شەیتانەکان بڵاوە دەکەن ئەودەمە. لەپاش تاریکداهاتن سەعاتێک وەکوو چوو وازیان لێ بێنن بشگەڕێن قەی ناکا. دەرگات کلیل بدە. ناوی خوداش لەسەرێنە یەعنی بڵێ (بسم الله الرحمن الرحیم) چرات بکوژێنەوە ناوی خودای لەسەر بێنە. دەرکەی کوندەی ئاو یا شیر بەداوێک ببەستە ناوی خودای لەسەر بێنە سەری قاپت داپۆشە ناوی خودای لەسەر بێنە.

(ش): لەبۆ خۆپاراستن لەشەیتانەکان. چونکی شەیتان سەرپۆش لاتابا. گرێی کوندە ناکاتەوە دەرکەی کلیل دراو ناکاتەوە. ئازار بەمنداڵتان ناگەیەنی لەداپۆشینی قاپ ئەمین بوونیش دەبی لە جروجانەوەر (حشرات) وەبایەکیش لەهەموو ساڵ یەک شەو دێتە خوارێ

ئەم وەبایە (نەخۆشی‌یە) هەر قاپێکی سەری دانەپۆشرابی دەچیتە ناوی هەر کوندەیەکی گرێ نەدرابی دەچیتە ناوی.

**٨٢٩: عَن ابن عمر (ض) ها إِنَّ الفِتْنَةَ هيهنا إِنَّ الفتنةَ هيهُنا مِن حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشيطانِ.**

**تەرجەمە**

٨٢٩: دەگێڕنەوە لەعبدالله کوڕی عومەر ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) ئامازەی (اشارە) بۆلای ڕۆژهەلات کرد دووجار فەرمووی جێگەی فتنەو بەلایان ئەو لایەیە ئەو جێگایەی کە شاخی شەیتان لەوی بەدەر دەکەوی. ئەمە لەمعجزەکانی پێغەمبەرە لەمێژووی نووسینی ئەم کتابە کە ١٣٧١ هیجریە هەزارو نوصەدو پەنجاو یەکی میلادیە فتنەو بەلای گەورە هاتەجێ(١) (خودا بەچاکەی خۆی نەجاتی دین و دونیامان بمانخاتە ژێر سێبەری بەیداغی پێغەمبەر (د)).

**٨٣٠: عَنْ سليمانَ ابن صُرَدٍ (ض) إِنِي لأعلَمُ كِلِمةً لو قالها ذَهَبَ عنه مايجدُ لوْ قالَ أعوذ بالله من الشيطان. ذهب عنه مايجِدُ. فقالوا لَهُ إِنَّ النبيَّ صلى الله تعالى عليه وسلم قالَ تَعوَّذ باللّهِ مِنَ الشيْطانِ فَقالَ وَهَلْ بي جنونٌ.**

**تەرجەمە**

٨٣٠: دەگێڕنەوە لەسلیمان کوڕی صوردی خزاعی (رەزای خودای لێ بی) گوتی لەخدمەت پێغەمبەر (د) دانیشتبووم دوو پیاویش، جنێویان بەیەکتری دەدا یەکی‌یان لەرقان ڕووی سوور داگەڕابوو ڕەگی ملی ئەستوور ببوو پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی من. کلیمەیەک دەزانم ئەگەر ئەم کلیمەیە بلێ ئەم ڕق لێ بوونەوەیە دەچی ئەگەر بلێ (اعوذ بالله من الشیطان) ڕقەکەی دەچی. بەپیاوەکەیان گوت پێغەمبەر (د) فەرمووی بەخودای خۆی لەشەیتان بپارێزی گوتی چما من شێتم.

(ش): ئەوەوی گوتیتی ئەم قسەیە قسەی کەسێک نی‌یە لەسەر شەریعەتی پاک ڕەفتار بکا ممکنە ئەم پیاوە منافق بووە.

---

(١) لێرە نەمانزانی مەبەستی دانەر لەم قسەیە چی‌یە.

٨٣١: عَن أَبي هريرةَ (ض) التَّثاؤبُ مِنَ الشيْطانِ فاذا تَثائَبَ اَحَدُكمُ فليَرُدُّهُ مااستطاعَ فان اَحَدَكُم اِذا قالَ (ها) ضَحِكَ الشيطانُ.

### تەرجەمە

٨٣١: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بی) پێغەمبەر (د) فەرمووی باوەشک لەلایەن شەیتانە ئنجا ئەگەر یەکێکتان باوشکی هاتێ هەتا پێ ی دەکرێ با بیگێڕێتەوە. چونکی یەکێکتان وەکوو لەکاتی باووشک بەسەدای بەرز گوتی بەدرێژی (ها) شەیتان کەیفی خۆش دەبی پێ دەکەنی.

(ش): ئنجا لەمە وازاندرا سونەتە ئەگەر کەسێک باوشکی هاتێ بیگێڕێتەوە ئەگەر پێ ی نەگەڕاوە نەڵی (ها) بەڵکی بلێ: اعوذ بالله من الشیطان الرجیم. (واتە خۆم دەپارێزم بەخودا لەخراپەی شەیتان).

٨٣٢: عَن أَبي قَتادة (ض) الرُّيا الصّالِحةُ مِنَ اللّهِ. والحُلْمُ مِنَ الشَّيطانِ. فاذا حَلَم احدُكمُ حُلْماً يخافُهُ فلْيَبْصقْ عنْ يسارِهِ وليتعوَّذْ باللّهِ من شرِّها فانَّها لاتَضُرُّهُ.

### تەرجەمە

٨٣٢: دەگێڕنەوە لەئەبو قەتادە ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر (د) فەرمووی خەونی باش (ئنجا باشیەکەی چی بەاعتباری دیتێ بێ چی بە اعتباری تەعبیر بێ). لەلایەن خوداوەیە. خەونی خراپیش لەلایەن شەیتانە چونکی شەیتان نیشانی دەدا هەتا غەمناکی بکا و بیری بەلای خودادا بەخراپ بڕوا. ئنجا ئەگەر یەکێکتان خەونێکی خراپی دیت لێ دەترسا باتفێک بکاتە لای چەپێ بلێ بەخودا خۆم دەپارێزم لەخراپەی ئەم خەونە ئنجا خەونەکە زیانی پێ ناگەینی.

•

٨٣٣: عَن أَبي هُرَيْرَةَ (ض) اِذا استَيقَظَ اَحَدُكم مِنَ منامِهِ فَتَوضّأَ فَلْيَستَنثِرْ ثلاثاً فأنْ الشَّيطانَ يَبيتُ عَلى خَيْشومِهِ.

### تەرجەمە

٨٣٣: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو یەکیکتان لەخەو بەخەبەرهات پاشان دەست نوێژی شووشت باسێ جار ئاو لەلووتی وەربکا

چونکی شەیتان بەشەو خۆی لە لووتی مات کردووە.
(ش): توریشتی و بەیضاوی گوتوویانە خەیشوومِ کە ئێسقانی لووتە بەستراوە بەلای ناوەوەی مێشک کە جێگای هەستی هاویەشەو جێگای خەیاڵە ئنجا وەکوو خەوت خشت وخالی دەماغ لەلووت کۆدەبێتەوە وە پێوەی ڕەق دەبێتەوە. بەم خشتوخاڵ و چڵکەش هەستی مرۆڤ توندو تیژیەکەی دەچێ فکری ئالۆز دەبی خەونی خراپ دەبینی پاشان وەکوو هەڵستا لەخەو وازی لەلووتی هینا نەیشووشت سستی هەست. تێک چوونی مێشکی وای لێ دەکا کە نەتوانی بەتەواوی نوێژ بەجێ بگەیەنێ.

٨٣٤: عن ابن عمر (ض) اقتلوا الحَيَّاتِ واقتلوا ذا الطُّفْيَتَينِ والأبترَ فانَّهما يَطْمِسان البَصرَ ويستقسطانِ الحَبَلَ.

**تەرجەمە**

٨٣٤: دەگێرنەوە لەعبداللەی کوری حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی لەسەر مینبەر خوتبەی دەخوێندەوە. ماران بکوژن ئەو مارانەی دوو خەتی سپی لەسەریشتی هەیە. وە ئەو مارانە بکوژن کورت و ئەستوورن بێ کلکن چونکی ئەم دوو جۆرە مارە ڕۆناکی چاو دەبەن. و بەر بەژنی سک پڕداوێن یەعنی وەکوو تەماشای بکا.
(ش): بۆیێ بەتایبەتی فەرمان بەکوشتنی ئەم دوو جۆرە مارە کرا لەبەر ئەمەیە چونکی بێ دینەکانی ئەجنە شەیتانەکان خۆیان ناخەنە سەر صورەتی ئەم دوو تەرزە مارە ئنجا ئەگەر بیکوژی بەڕاستی ئەوە مارت کوشت. ئەجنەت نەکوشت

٨٣٥: عن ابي هُرَيْرَة (ض) راس الكفر نحوَ المَشْرِقِ. والفَخْرُ والخُيَلاءُ في اَهْلِ الخَيْلِ والابِلِ والفدّادين اَهْلِ الوَبْرِ. والسكينَةُ في اَهْلِ الغَنَمِ.

**تەرجەمە**

٨٣٥: دەگێرنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی گەورەترین هۆیەکانی کفرو سەرچاوەی کوفر لەلای ڕۆژهەلاتە. ڕالەخۆیی و دەعیەو شانازی کردن لەو ڕەشماڵ نشینانەیە کە وولاغ و ووشتری زۆر ڕادەگرن وە لەخاوەن جۆتو فەلاحەتە. هێمنی و لەسەرخۆیی و قەرارگرتن لەخاوەن مەڕە دەعیەو خۆ بەگەورە زانینیان نییە.

٨٣٦: عن ابن مسعودٍ (ض) الايمانُ يَمانٍ هيهُنا اَلا إنَّ القَسْوَةَ وغلظَ القلوبِ في الفدَّادينَ عِنْدَ اصول انناب الابلِ حيثُ يَطْلُعُ قَرنا الشَّيطانِ في رَبيعةَ وَمُضَرَ.

### تەرجەمە

٨٣٦: دەگێڕنەوە لەمەسعودی بەدری ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) ئاماژە (اشارە)ی بۆلای یەمەن کرد فەرمووی ئیمان و باوەڕ یەمەنیە یەعنی دەدرێتە پاڵ یەمەن باوەڕهینان. چونکی بەشی زۆری ئیمانداراني تەواو خەلکی یەمەنن، وەبێ ئەزیەت و زەحمەتکێشان موسلمان بوون وە ئیمانیان هینا. بەلام موراد (مەبەست) لەم حەدیثە کاتی پێغەمبەر بووە نەک هەموو خەلکی یەمەن لەهەموو زەمانێک. دل ڕەقی و دلی پیسی لەنێو ئەوانەدایە ووشتریان زۆرە لای بن کلکی ووشتران کە دەنگیان لێ دەدەن لەکاتی ئاژووتنیان. لەو جێگایەی کە هەردوو لاسەری شەیتان بەدیاردەکەوی (کەڕۆژهەلاتە بۆیێ ڕۆژپەرستەکانی کە سەجدە بۆ ڕۆژ دەبەن گوایە سەجدە: بۆ سەری شەیتان دەبەن). ووشتر زۆرەکانی دل ڕەقیش کە ڕەبیعە و موضەرن کە دوو عەشیرەتی گەورەن.

(ش): مەبەست زیادە تەسلوطو دەسەلاتداری و زیادە کفر لەلای ڕۆژهەلات هەروەکوو لەحەدیثی پێش ئەمە. کە لەئەبو هورەیرە ریوایەت کراوە فەرمووی (راس الكفر نحو الشرق. لەخطی فَدَّائِيْن بەتەشدید جەمعی فەدادە. ئەوکەسەیە کە لەدووصەد ووشتری کەمتری نەبی لەوەندەش زیاتر هەرچەندە بڕوا. ئەگەر بەسووک کردنیش بێ بێ جەمعی موکەسەرە. لەفدانە بەمەعنا ئەسباب و ئالاتی جوتو زراعەت. بەهەردوو ڕیوایەتیش هاتووە.

٨٣٧: عَن اَبي هريرة (ض) إذا سَمِعْتُم صياح الدِّيكَةِ. فاسئلوا اللّهَ من فضلِهِ فانها رأت ملكاً. وإذا سَمِعتُمْ نهيق الحمار فتعوَّذوا بالله من الشيطانِ فانه رأى شيطاناً.

### تەرجەمە

٨٣٧: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو بانگی کەلەشێرتان بیست. بۆخۆتان لەخودا بپاڕێنەوە هەتا بۆتان بیێتە هۆی تەئمینی دوعاتان. وشاهیدی گوناهتان. و استغفاری گوناهانە وە شاهیدی مل کەچی و دلسۆزیتان

چونکی مەلائکەی دیوە. وە ئەگەر دەنگی کەرتان بیست خۆتان بەخودا بپارێزن لەشەیتان چونکی شەیتانی دیوە.

(ش): لەم حەدیثە پیروزە وادەزاندرێ کە کەلەشێر پیرۆزە بۆیێ قازی حسێن فەتوای داوە غەیری ئەویش لەشافعیەکان کە دەڵێن دروستە. اعتمادکردن لەسەر بانگی کەڵەشێری موجەرەب بۆ زانینی کاتەکانی نوێژ. بەم تەرزە دەنگەکەی ئەو بگێڕی بو بەلگەو عەلامەت بۆ اجتهاد. امامی احمد حەدیثی زەیدی کوڕی خالدی گێراوەتەوە [لاتسبّو الديكَ فانه يدعو الى الصلاةِ] حەلیمی لەم حەدیثەی وەرگرتووە. هەر شتێکی سوودی لێ وەربگیرێ بۆچاکەیەک. شایانی ئەوە نیه جنێوی پێ بدرێ بەلکی شایانی ئەوەیە ڕێزی لێ بگیرێ مەعنای دەعوەتیش هەر ئەمەندەیە بانگدانی لەکاتی بەیان و نیوەڕۆ دەبیتە بەلگە (ئەمارەت) مەعنای بانگی ڕاستەقینە نیه وەکوو بانگی شەرعی.

٨٣٨: عَن اَبي هُرَيْرةَ (ض) فُقِدَت امَّةٌ مِنْ بَني إسْرائيل لايُدرى مافَعَلَت وإنّي لأراها اِلاّ الفارَ. اِذا وُضِعَ لها البانُ الأبلِ لَمْ تَشْرَب. وَاذا وُضِعَ لها البانُ الشاةِ شَرِبَت.

**تەرجەمە**

٨٣٨: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی جەماعەتێک لەئەولادی یەعقوب پێغەمبەر بزربوون نازانرێ چیان بەسەرهات من لام وایە هیچیتر ئەوان نین مشک نەبن. چونکی وەکوو شیری ووشتریان بۆ دابنرێ نایخۆنەوە (چونکی گۆشتو شیری ووشتر حەرام کرا لەسەر ئەولادی یەعقوب). وەکو شیری مەڕیشیان بۆ دابنرێ دەی خۆنەوە (چونکی لێیان حەرام نەکراوە).

ئەبو هورەیرە گوتی ئەم حەدیثە بۆ کەعبی کوڕی مانعی ناسراو (بەکعب الاحبار) خوێندەوە. چەند جار لەسەر یەکتری پێی گوتم تۆ ئەم قسەیەت خۆت لە پێغەمبەرت بیستووە. گوتم ئەدی خۆ تەوراتم نەخوێندووە لەتەورات نەقلی بکەم ئەوی من بیلیم لەلایەن پێغەمبەرەوەیە (١).

---

(١) (ش): اختلاف لەمەمسوخ واقع بووە - واتە ڕای جیاجیا هەیە دەربارەی گۆڕانی کەسێک بۆ حەیوان یان ئاژەل. لای ئەبو اسحاقی زجیاج و ابن العربی. ئەو مەیمونێکی کە ئێستا هەیە لەو مەیمونانە کەوتوونەتەوە کە مەسخ کراون واتا مرۆڤ بووینە بووینە مەیمون بەدەلیلی ئەم حەدیثە لای جمهور کە

٨٣٩: عَنْ أَبي هُرَيْرةَ (ض) اِذا وَقَعَ الذُّبابُ في شَراب احدِكُمْ فَلْيُغْمِسْهُ ثمَّ لِينَزَعْهُ فأنَّ في احدى جَناحَيْهِ داءاً وفي الاخرى شِفاءاً.

### تەرجەمە

٨٣٩: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکوو مێشە ڕەشکە کەوتە نیو مەشروباتی یەکێکتان بانقومی بکا پاشان فڕەی بدا. چونکی بێ شک لەلابالێکی دەرد هەیە لەلایەکەی تریش شفا هەیە. قیاسی هەموو حەیوانی بێ خوێن لەمێش کراوە.

(ش) لەم حەدیثە وەرگیراوە ئاوی کەم پیس نابێ بەکەوتنە ناوی حەیوانی بێ خوێن، چونکی ئەگەر پیسی بکردایە فەرمانی نەدکرد بەتێ هەلینان (غەمس) بەلکی فەرمانی بەڕشتنی دەکرد بەلاّم ئەگەر مێشەکە ڕەنگی ئاوەکەی گۆڕی پیس دەبی.

٨٤٠: عَن أَبي هريرةَ (ض) غُفِرَ لامرأةٍ مومِسةٍ مَرَّت بكَلْبٍ على رأس رَكّيٍّ يَلْهثُ كادَ يقتُلُهُ العَطَشُ فنزَعَت خُفَّها فاوثَقَهُ بخمارِها نزَعت له من الماءِ فَغُفِرَ لهَا بذلك.

### تەرجەمە

٨٤٠: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی ژنێکی فاحشەو زانیە عەفو کرا لەلایەن خودای گەورە. بەلای سەگێکدا ڕەت بوو لەسەر بیرێکی هەلنەراو زمانی دەردەهینا لە تینان نزیکبوو تینوەتی بیکوژی کەوشەکەی خۆی لەقاچی خۆی دارنی لەچارۆگەی خۆی قایم کرد وەکوو دەولک هەندێ ئاوی لەبیرەکە بۆ هینا دەرێ سەگەکەی ئاودا بەواسطەی ئاودانی سەگەکە لەگوناهی زنایەکان و گوناهەکانی تریش عەفووکرا.

---

پەسەند دەکرێ واتیە لەبەر حەدیثی کوری مەسعود بە مەرفوعی (إن الله لم يُهْلِكْ قَوْماً او يعذّب فيَجعَلْ له نسلاً وان القِردةَ والخنازيرَ كانوا قبْلَ ذلِكَ). وەلامیشیان داوەتەوە لەم حەدیثە پێغەمبەر (د) ئەم حەدیثەی لەپێش وەحی بەحەقیقەتی ئەمربووە بۆیە بەشێوەیەکی قەطعی ئەدا نەکردەوە بەلکی فەرموویتی لام وایە بەمەزەندە بەلاّم لەحەدیثی کوری مەسعود ئەفیەکەی بەشێوەیەکی قەطعی ئەدا فەرمووە.

٨٤١: عَن أَبي هريرة (ض) خَلَقَ اللّهُ ادَمَ وَطولُهُ ستّونَ ذِراعاً ثُمَّ قال اذْهَب فسَلِّم على اؤلئكَ الملائكةِ فاستمع مايُحيّونَكَ تحيتُكَ وتحيةُ ذرّيَتِكَ فقالَ السلام عليكُم فقالوا السلامُ عليكَ وَ رَحمة اللهِ فزادوه ورحمة اللهِ فكُلُّ مَن يَدخُلُ الجنّةَ على صورة ادَمَ فَلَمْ يزالِ الخلقُ ينقُصُ حتّى الآن.

## تەرجەمە

٨٤١: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی خودای گەورە ئادەمی دروست کرد درێژی شەست گەزبوو (بەرینی حەوت گەزبوو). پاشان فەرمووی بچۆ سەلام لەو مەلائکانە بکە گوێش بدێ چلۆن وەلامی سەلامت دەدەنەوە ئەم سەلامە سەلامی تۆیە وە سەلامی زادەکانی تۆیە - واتە ئەو منداڵانەی لەتۆ دەبن. ئنجا حەزرەتی ئادەم گوتی السلام علیکم مەلائکەش گوتیان وعلیک السلام ورحمته لەفظی رحمة الله یان زیاد کرد. ئنجا ئەوەی کە دەچیتە بەهەشت لەسەر بەژن و صورەتی ئادەمە. پاشان عالەم کەوتە کەمی لەجوانی ودرێژی ئادەم هەتا ئێستا.

(ش): ابن قوتەیبە دەلێ: ئادەم بێ موویووە ریش و موو لەئەولادی پەیدا کرد.

٨٤٢: عَن أَنَسٍ (ض) خبَّرني بِهِنَّ انِفاً جبريلُ أَمّا اوّلُ اَشراط السّاعةِ فنارٌ تَحشُرُ النّاسَ مِنَ المشرقِ اِلى المغربِ. وَأَمّا اوّلُ طعامٍ يَأكُلُهُ اَهلُ الجنّةِ فزيادَةُ كبدِ الحوتِ وَاَمّا الشّبَهُ في الوَلَدِ. فانَّ الرَّجُلَ اِذا غَشِيَ المرأةَ فَسبَقَها مائُهُ كانَ الشّبَهُ لَهُ. وَاِذا سبقَ ماؤها كان الشّبهُ لها. قالَ عبدالله ابن سلام اَشهَدُ اَنَّكَ رَسولُ اللّهِ. ثمّ قالَ يارسول الله اِنَّ اليهودَ قومٌ بُهْتٌ اِنْ عَلِموا باِسلامي قَبْلَ اَن تَسئلَهُمْ بَهَتوني عِندكَ. فجاءَتِ اليهودُ ودَخلَ عبدالله البيت فقالَ رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم اَيُّ رجُلٍ فيكم عُبداللّهِ ابنِ سَلام. قالوا أعلَمُنا وابنُ أَعلمِنا وَاَخيَرُنا وابنُ اخيَرِنا فقال رسولُ الله صلى الله تعالى عليه وسلم افرأيتُم اِن اسلَمَ عبدالله قالوا اعاذَهُ الله مِن ذلِكَ. فخرجَ عبدالله اليهم فقالَ اشهَدُ اَنْ لا اله الاّ اللّه. واَشهَدُ اَنَّ محمداً رسول الله فقالوا شرُّنا وابنُ شرِّنا وَوقعوا فيهِ.

## تەرجەمە

٨٤٢: دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بی گوتی وەکوو خەبەر گەیشتە عبداللەی کوڕی سەلام ی -اسرائیلی کە پێغەمبەر (د) بەهاتنی خۆی مەدینەی ڕۆناک کردەوە هاتە

خدمەت پێغەمبەر پێی گوت من سێ پرسیار لەتۆ دەکەم ئەگەر پێغەمبەر نەبن وەڵامیان نازانن: ١- یەکێیان یەکەم نیشانەی قیامەت چی‌یە. ٢- دووەم یەکەم خواردنی ئەهلی بەهەشت چی‌یە کە لەبەهەشت دەی خۆن. ٣- سێ‌یەم هۆی چی‌یە هەندێ منداڵ بەباوکی دەچی هەندیکیش بەخاڵەکانی دەچی. پێغەمبەر (د) فەرمووی لەمەپێش بەسەعاتێک جوبرائیل وەڵامی هەرسێ پرسیاری بەمن گوت. عبدالله گوتی ئەم جوبرائیلە دوژمنی جووەلەمەلائکە. پێغەمبەر (د) فەرمووی بەوەڵامدەرەوە. ئەما یەکەم نیشانەی قیامەت ئەمەیە ئاگرێک خەلک کۆ دەکاتەوە لەرۆژهەلات بۆ رۆژئاوا وە ئەما یەکەم خواردنی ئەهلی بەهەشت زێدە جەرگی ماسی گەورەیە. وە ئەما بەیەکچوونی کوڕ بەباوکی یا بەخالی لەبەر ئەمەیە لە جماعی پیاو لەگەڵ ئافرەتی خۆی (واتە لەکاتی جووت بوون) ئەگەر ئاوی پیاو پێش کەوێ لەهاتنە خوارەوە لەکاتی جووت بوون مناڵ بەباوکی دەچی ئەگەر ئاوی ئافرەتیش پێش کەوی بەدایکی ئەچی. عبدالله گوتی (أشهد انک رسول الله) یەعنی بەزمان دەلێم بەدڵ باوەڕدەکەم تۆ بێ شک پێغەمبەری خودای. پاشان گوتی ئەی پێغەمبەری خودا جوولەکە قەومێکن بوختان کەرو درۆزنن ئەگەر بزانن من موسولمان بووێە ئنجا بێنە خدمەت تۆ پرسیاریان لێ بکە زۆر بوختانم پێ دەکەن لەخدمەت تۆ پاشان جوولەکە هاتن بۆ خدمەت پێغەمبەر (د) عبداللەش بۆ مالی خۆی چۆوە. پێغەمبەر (د) فەرمووی عبدالله کوڕی سەلام لەناو ئێوە چلۆن پیاوێکە. گوتیان زاناترین کەسە لەناو ئێمە باوکیشی زانای کوڕی زانایە لەناو ئێمە. پێغەمبەر (د) فەرمووی ئێوە پێم بلێن ئەگەر ئەو موسولمان بوبی ئێوەش موسولمان دەبن. گوتیان خودا بی پارێزی لەموسولمان بوون. عبدالله بۆیان لەخانوو هاتە دەرێ گوتی أشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله. گوتیان ئەمە بەدترین ئێمەیە ئیتر دەستیان کرد بەغەیبەت کردنی.

٨٤٣: عَن اَبي هُرَيْرَةَ (ض) لولا بنو اسرائيلَ لم يَخْنَزِ اللَّحمُ ولولا حوَّاءُ لم تخُنْ أنثى زوجَها.

**تەرجەمە**

٨٤٣: دەگێرنەوە لەئەبو هوریرە رەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەگەر لەبەر بەنی ئیسرائیل نەبوایە گۆشت بۆگەنی نەدەبوو. ئەگەر لەبەر خیانەتی حەواش نەبوایە دەرحەق بەئادەم هیچ ژنێک خیانەتی نەدەبوو دەرحەق بەمێردی خۆی.

٨٤٤: عَن أنسٍ (ض) إنَّ اللّهَ يقولُ لأهوَنِ أهلِ النارِ عذاباً لَو انَّ لَكَ مافي الأرضِ مِن شيءٍ كنتَ تفتدي بِه. قالَ نَعَمْ قالَ فقد سألتُكَ ماهوَ أهوَنُ مِن هذا وانتَ في صُلْبِ ادَمَ أنْ لاتُشرِكَ بي فأبيْتَ إلاّ الشِّركَ.

## تەرجەمە

٨٤٤: دەگێڕنەوە لەئەنەسی کوری مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی خودای گەورە بەسووکترینی عەزاب لەئەهلی ئاگر ئەگەر هەرچی لەعارد هەیە ملکی تۆ بوایە خۆت پێ دەکریەوە لەم عەزابە دەلێ: بەلێ. خودای گەورە دەفەرموێ تۆ وەکوو لەپشتی ئادەم بووی لەعالەمی ئەرواح شتێکی سووکترم لەتۆ داوا کرد کە شریک بۆ من پەیدا نەکەی پەیمانیشم لەتۆ وەرگرت پاشان لەهەموو شتێکی پەیوەندی بەکاروباری خوایەتی بوو بێت نەت کرد لەشیرک نەبێ وەکوو تۆم هێنا دونیا لەسەر خیلافی وەعدەت.
ش: ئەم سووکترین عەزابە لەئەهلی ئاگر گوتراوە ئەبو طالبە.

٨٤٥: عن عبدالله (ض) لاتُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْماً إلاّ كانَ علی ابنِ آدَمَ الأوّلِ كِفْلٌ مِن دمِها لإنَّهُ أوّلُ مَن سنَّ القَتْلَ.

## تەرجەمە

٨٤٥: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوری مەسعود ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی هیچ یەکێک لەانسان ناکوژرێ بەناحەق مەگەر بۆ کوری پێشووی ئادەمیش هەیە لەعەزابی ئەو کوشتنەش بەشێک (کەقابل هابلی کوشت) چونکی ئەو یەکەم کەس بوو کوشتنی کردە عادەت لەسەر ڕوویی عارد.

٨٤٦: عَن زينبَ بنتِ جحشٍ (ض) لا اله الا الله وَيْلٌ لِلعَرَبَ مِن شَرٍ قد اقترب. فُتِحَ اليَوْمَ مِن رَدْمِ يأجوجَ ومأجوجَ مِثلُ هذه وحلَّقَ باصبُعَيْه الابهامِ والتي تليها. فقلت يارسول الله أنهلِكُ وفينا الصالحون قالَ نَعَمْ إذا كَثُرَ الخَبَثُ.

## تەرجەمە

٨٤٦: دەگێڕنەوە لەزەینەبی کچی جەحش ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) جارێک بەشێوەیەکی ترس هاتە ژوورێ فەرمووی لا اله الا الله. واوەیلاو سەختی بۆ

عەرەب لەشەڕو فتنەیەکی کەنزیک بووە (کەمەفسەدە خراپەی یاجوج و مەئجوج و کافرەکانی ڕۆژهەلاتە) بۆیێ فەرمووی کرایەوە ئیمرۆ سەدی (بەربەست) یەئجوج و مەئجوج وەکوو ئەمە ئەنگوستی بەرگەی گەورە وە ئەنگوستی شەهادەی کردە ئەلقە. وەکو ڕەقەمی (٩) منیش پێم گوت ئەی پێغەمبەری خودا ئیمەش دەفەوتێین کە چەند پیاوی باشیشمان لەنێودا هەیە فەرمووی بەلێ هەر کاتێک بێ دینیو درۆو زینا زۆربوو. (لای هەندێکان مەبەست لەخبث تەنیا زیناو مندالی زینایە).

(ش): لێرە مەبەست لە (سد) سەدی ڕاستەقینە نی‌یە کە سەدی ئەسکەندەربوو لەزەمانی خۆی. بەلکی مەبسەت. شەوکەتی شەریعەتی ئیسلامە کە کفاری حەپس کردووە لەدەرچوون بۆ سەر ئیسلام. هەر وەقتێ قەلای شەریعەتی ئیسلام ئاوەدانی و ڕێکی نەما کون و کەلەن و دەرگەی لێ پەیدابوو بەهۆی هەلبژاردنی دونیا لەسەر دین. پارێزەرانی دین و علم. یەئجوج و مەئجوج و دەجال کەچەند پاشایەکن لەکافران لەهەموو لایەکی قەلای شەریعەتەکەمان کە بە سەریەکدا ڕماوە هێرش دەکەنە سەر وولاتانی ئیسلام:

دانەری ئەم شەرحی بوخاریە دەلێ: هەر کەسێک کە لە تەئریخی هەزارو سی سەدو حەفتاویەکی هیجری ١٣٧١ و هەزار و نوسەدو پەنجاو یەکی میلادی هەیە لەبەر عیلمەک کە بەچاو دەی بینی بە هاتنە جێی ئەم حەدیثە پیرۆزە حەق نیە باوەڕی کەمتر بێ لەئەصحابی پێغەمبەر چونکی ئەوان تەنیا بیستیان. بەلام ئێمە لەگەلێ بیستن دیتیشمان. ئنجا کەی دیتن وەکوو بیستن وایە. بەکورتی مەبەست لەسەدی یەئجوج و مەئجوج. قەلای شەریعەتی اسلامە مەبەستیش لەکردنەوەی سەد شێوانی شەریعەتە بەزۆر بوونی زیناو بێ حەیاییو سفوری ژنانی قاچ و قۆل ڕووت. نابینی ئەگەر مەبەست لەسەد شەریعەتی اسلام نەبوایە شێخ محمدی بوصیری ئەی دەفەرموو:

بەشیعر:

أحلَّ امَّتَهُ في حرزِ مِلَّتِهِ
كالليثِ حَلَّ مع الاشبالِ في أجَمِ

یەعنی:

محمد لە اسکانی ئومەتی خۆی لەنێو قەلای شەریعەتی وەکو شێربو دا مەزرا بێ لەگەلێ بێچوەکانی لەقەرار گاهی بێشە.

٨٤٧: عَن أَبي سعيدِ الخُدْري (ض) يقولُ اللّهُ تعالي يا آدَمُ فيقولُ لبَّيْكَ وسَعْدَيْكَ والخَيْرُ في يَدَيْكَ. فيقولُ أخرِج. بَعْثَ النّارِ قالَ مابَعْثُ النّارِ. قالَ مِنْ كُلِّ ألفٍ

تسعمائةَ وتسعة وتسعينَ. فَعِنْدَهُ يَشِيبُ الصَّغيرُ. وتضَعُ كلُّ ذاتِ حَمْلٍ حَمْلَها. وترى النَّاسَ سُكَارى وماهُمْ بِسكارى ولِكن عذابَ اللّهِ شديد. قالوا يارسولَ اللّه وأيُّنا ذلِكَ الواحِدُ. قال أبشِروا فانَّ مِنْكُمْ رَجُلٌ وَمِن يأجوجَ وَمأجوجَ الفٌ ثم قالَ والذي نفسي بيدهِ إنِّي أرجو أَن تكونوا ربعَ أهلِ الجنَّة فكبَّرنا. فقالَ أرجو ان تكونوا ثُلُثَ أهلِ الجنَّةِ فكبَّرنا فقالَ أرجو ان تكونوا نصفَ أهلِ الجنَّةِ فكبَّرنا. فقال ماانتم في النَّاسِ إلاّ كالشَّعْرَةِ السَّوداءِ في جَسَدِ ثَوْرٍ أبيضَ أو كشَعْرَةٍ بَيْضاءَ في جلدِ ثَوْرٍ أسوَدَ.

## تەرجەمە

٨٤٧: دەگێڕنەوە لەئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی ڕۆژی قیامەت خودای گەورە بەحەزرەتی ئادەم دەلێ ئەی ئادەم: دەڵێ [لَبَّيْكَ وسعديْكَ والخيْر في يديكَ] (یەعنی جوابت دەدەمەوە بەلزومی طاعەت و بەیارمەتی تۆ لەسەر جواب دانەوەم کە چاکەو خێریش هەمـوو لەتۆوەیە). ئنجا خودای گەورە فـەرمان بەئادەم دەکا لەئەولادەکانت ناردراوانی ئاگر بینە دەرێ ئادەم دەلێ ناردراوانی ئاگر کێن وە چەندن خودای گەورە دەفەرمویێ. عـالەمی مەحشـەر دەکەونە ناخۆشی‌یەکو غەمێکی وا. بالفرض ئەگەر پیربوون هەبوایە. منالی بچووک پیردەبوو لەغەمـان. ولە فەرزیدا ئاووس بوون هەبوایە ژنی سک پڕ لەبەر ناخۆشی ئەم ڕۆژە حەملی فڕەدەدا. لەترسی ئەم قسەیە دەبینی ئەهلی مەحشەر بێ هۆشن وانیە بێ هۆشیەکەشیان لەبەر ئارەق خواردنەوەبی بەلام عەزابی خودای گەورە سەخت و گرانە. ئەو ئەصحابانەی لەو ئەنجومەنە بوون پێ‌یان گوت. ئەویکەی کە ئەهلی نەجاتە لەئێمە کێ‌یە؟. فەرمووی. موژدەتان لێ بی بەڕاستی پیاوێک لەئێـوەیە هەزار لە یەئجـوج و مـەئجوجە لەریوایەتێکی تر نوسـەدو نەوەدونۆ لەیەئجوج و مـەئجـوجـە. یەکـێک لەئێـوەیە. پاشـان فـەرمـووی بەحـەقی ئەو خـودایەی کە روحی منی بەدەستە من ئومێدم هەیە ئومەتی من یەک چارێکی ئەهلی بەهەشت بی ئێمەش لەخۆشی ئەم موژدەیە گـوتمان الله اکـبـر پاشـان فـەرمـووی من ڕجام هەیە ئێـوە یەک سێ‌یەک بن لەئەهلی بەهەشت ئێمەش لەخۆشیان گوتمان الله اکبر. پاشان فەرمووی ڕجام وایە ئێوە نیـوەی ئەهلی بەهەشت بن ئێمەش گوتمان الله اکبر. پاشان فەرمووی ئێوە لەناو عالەمی مەحشەر وەکوو یەکدانە مووبی ڕەشن لەپێستەی گایێکی سپی یا وەکو یەکدانەموویی سپێن لەپێستەگایێکی ڕەش.

(ش): ئەمە لەمەحشـەر نسبەتی زۆرو کەمی ئومەتی محمد. لەگەڵ عالەم وایە. بەلام لەبەهەشت ئومەتی محـمد نیـوەی ئەهلی بەهەشتن یا دووسێ‌یەکی خەلکی بەهەشتن. لەم

حەدیثە پیرۆزە زاندرا هەرچی ئیماندار نەبی. یەئجوج و مەئجوجە مەبەستیش لەیەئجوج و مەئجوج بەاعتباری سەرچاوە ئەو قەومانەن کە بەشی زۆری هێزیان لەسەر گوری و بلێسەی ئاگرو گەرمایی کهربائیە [ئەجیج] لەمەکینەی سەر سورهێنەرو قونبولەو مایەی تەقینەوەی وا کە حەسانەوەی نەهێشتتوون بەشەهادەتی ئایەتی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێ [ولایزال الذینَ کفروا تصیبهم قارعةٌ بما صنعوا] یەعنی هەرکات ئەوانەی کافربوون تووشیان دەبی قارعە لەأنواعی تۆپ و قونبەلەی سەرسورهێنەر بە تایبەتی بۆ خۆیان لفظی (ما) چی مصدریەبێ چی موصولە بێ چی موصوفەبێ ئەنجامی هەریەکێکە یەعنی بەوشتی کەخۆیان دەیکەن.

٨٤٨: عن ابن عباس (ض) إنكم تُحشَرونَ حُفاةً عُراةً غُرْلاً ثمَّ قَرَأَ كما بَدَأنا اوَّلَ خَلْقٍ نعيدهُ وَعْداً علَيْنا اِنَّا كُنَّا فاعلينَ وَاَوَّلُ مَن يُكسى يومَ القِيامَةِ إبراهيمُ وَاِنَّ اناساً مِن اَصحابي يُؤْخَذُ بِهِمْ ذاتَ الشمالِ فاقولُ أصحابي أصحابي فيُقالُ إنَّهُمْ لَمْ يزالوا مُرتَدّينَ على أعقابِهِمْ مُنْذُ فارَقْتَهُمْ فاقولُ كما قالَ العبْدُ الصالح وكنتُ عَلَيهِمْ شَهيداً مادُمْتُ فيهم اِلى قولِهِ الحكيم.

**تەرجەمە**

٨٤٨: دەگێرنەوە لەعبدالله‌ی کوری عەباس رەزای خودایان لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئێوە کۆدەکرێنەوە وەکوو دەرخران لەنێو قەبرەکانتان بەپێ خاووسی و بەرووتی و بەسونەت نەکراوی پاشان ئایەتی (كما بَدَأنا اوَّلَ خلقٍ نعيده وعداً علينا اِنَّا كنا فاعلين) ی خوێندەوە. وە یەکەم کەس لەپێغەمبەران کە بەرگی لەبەر دەکرێ رۆژی قیامەت ابراهیم پێغەمبەرە وە بەراستی هەندێ کەسیش لەئەصحابی من لای دەستی چەپیان پێ دەگرن یەعنی بۆ ئاگریان دەبەن. منیش بانگ دەکەم ئەمانە ئەصحابی منن. بەمن دەگوترێ کە تۆ لەوانە جودابوویەوە بەمردن، گەرانەوە بۆ کوفر. منیش دەلێم وەکوو بەندەی باش کە عیسایە گوتی (وكنت عليهم شهيدا مادمت فيهم هەتا قسەی خودای گەورە.. الحكيم.

(ش): مەبەست لەئەصحابی لێرە ئەصحابی پێغەمبەر نین کە موهاجیرو ئەنصارن بەلکی بەشێک بوون لەئەعرابی ئیمان زەعیف لەپاش وەفاتی پێغەمبەر (د) مورتەدبوون واتە هەلگەرانەوە لەئیسلام.

٨٤٩: عَن أَبي هريرةَ (ض) يَلْقى اِبراهيمُ أَباهُ آزرَ يومَ القيامَةِ. وَعلى وَجْهِ آزرَ قَتَرَةٌ وَغَبرَةٌ فَيقولُ لَهُ ابراهيمُ. اَلم اقُل لَكَ لاتَعْصِنِي فيقولُ ابوهُ فاليومَ لاأعصيكَ فيقولُ ابراهيمُ يارَبِّ اِنَّكَ وَعدتَني اَن لاتُخْزِيني يَوْمَ يُبعثونَ فايُّ خِزيٍ اَخزى مِن اَبي الأَبعَدِ. فيقولُ اللّه عزّوجَلّ اِنّي حرّمتُ الجَنَّةَ على الكافرينَ. ثم يُقالُ ابراهيمُ ماتَحتَ رِجلَيْكَ فَيَنْظُر فاذا هُوَ بِذَيْخٍ مُتَلطِّخٍ فيُؤخَذُ بِقَوائمه فيُلقى في النّارِ.

## تەرجەمە

٨٤٩: دەگێرنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی ابراهیم سەلامی خودای لێ بی ڕۆژی قیامەت توشی ئازەری باوکی دێ کە نازناوی (تارح) بوو بەڕوویەکی دووکەلاوی و تۆزو ناشیرن. ئنجا ابراهیم پێی دەلێ. ئەدی پێم نەگوتی بەپێچەوانەی من مەجوولێ وە. باوکیشی دەلێ ئنجا ئیمڕۆ بەقسەت دەکەم بەپێچەوانەی تۆ ناجوولێمەوە. ابراهیمیش بەخودا دەلێ تۆ وەعدەت بەمن داوە کەمن زەلیل نەکەی ڕۆژی قیامەت. چە کەمی یەک هەیە مایەی نەنگی و زیلەت بێ لەوە زیاتر لەعەزاب دانیی باوکی کافر کە دوورترە لەڕەحمەتی خودا لەفاسق. ئنجا خودای گەورە فەرمووی بەڕاستی من حەرامم کردووە بەهەشت لە کافران. لەپاشان دەگوترێ ئەی ابراهیم ئەمە چیە لەژێر قاچەکانت. وەکو تەماشا دەکا نێرە کەمتیارێکی زۆر بەموو لەخوێن و پیسایی وەردراوی چاو پێ دەکەوی. ابراهیم بێزێکی زۆری لێ دەکاتەوە ئەلێ تۆ باوکی من نی. ئنجا چواریەلی دەگیرێ و فڕێ ئەدرێتە ناو ئاگر.

ش: حیکمەت لە تەمەثول و تەمەسوخی ئازەر بەصورەتی کەمتیار بێ عەقلی کەمتیارە زیاد لەحەیوانات چونکی غافل دەبی لەشتێکی کەواجبە لەوشتە هوشیارو ئاگاداربی. ئازەریش بەقسەی بەبەزەییی ترینی خەلکی نەدەکرد بەخۆی کە کوڕی خۆی بوو. بەقسەی دوژمن ترین دوژمنانی دەکرد کە شەیتانە.

٨٥٠: عن أبي هُرَيرَةَ (ض) قيلَ يارسولَ اللّهِ مَنْ أَكْرَمُ النّاس. قالَ اتقاهُم فقالوا لَيْسَ عَنْ هَذا نَسْئَلُكَ قالَ فيوسفُ نبيُّ الله ابن نَبِي اللهِ ابن خَليلَ اللّهِ. قالوا لَيْسَ عنْ هذا نَسْئَلُكَ قالَ فَعَنْ مَعادِنِ العَرَب تَسْئَلونَ خِيارُهُم في الجاهِلِيَّةِ خِيارُهُم في الأسلام اذا فَقُهوا.

### تەرجەمە

٨٥١: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی بەپێغەمبەر گوترا ئەی پێغەمبەری خودا. لەخەلکی کێ بەقەدرو گەورەترە فەرمووی ئەوەی زۆرتر خۆی دەپارێزی لەگوناهان. پێیان گوت ئێمە لەم ڕووەوە کردەوەی چاک لەتۆ پرسیار ناکەین. فەرمووی دەربارەی -نەسەبە- یوسف پێغەمبەرە کوڕی پێغەمبەرە کوڕی پێغەمبەرە کوڕی پێغەمبەرە کوڕی خەلیلی خودای گەورەیە. پێیان گوت لەم بارەیەش لەتۆ ناپرسین فەرمووی ئەدی لە بنەمالی عەرەبانم لێ دەپرسن باشترین ئەوان لەجاهلیت باشترینی ئەوانە لەاسلام وەکو گەران بەماهیرو شارەزا لەدین وە بەخوێندەوارو زانا.

(ش): ئەمە ئیشارەیە وەبال ئەمە کە تەفاوتی قەدر لەجاهیلیەت بەگوێرەی ڕەچەلەکو گەورەیی باب و باپیرانی ئەصلە لەئیسلامەتی گەورەیی بەباب باپیرو نەسەب نی یە بەلکو بەزانایی یە. کەوایە موسولمانی نەسەبی گەورە نەبی بالاترە لەوەی نەسەبی هەبێ و زانا نەبێ.

٨٥١: عن سَمُرَةَ (ض) أتاني الليلَةَ آتيانِ فـأتَيْنا على رَجُلٍ طويلٍ لا أكـادُ أرى رَأْسَهُ طولاً وَأنَّهُ ابراهيمَ صلى الله عليه وسلم.

### تەرجەمە

٨٥١: دەگێڕنەوە لەسەمرەی کوڕی جوندوب ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئیمشەو جبرائیل و میکائیلم هاتنە لا منیان بردە لای پیاوێکی ئەمەندە درێژ نزیک نەبوو سەری ببینم لەدرێژیان وە ئەم پیاوە درێژەیش ابراهیم بوو سەلامی خودای لێ بی.

٨٥٢: عَن ابنِ عباس (ض) أمّا ابراهيمُ فانظروا إلى صاحِبِكُمْ. وأمّا موسى فَجَعْدٌ آدَمُ على جَمَلٍ احْمَرَ مخطومٍ بِخُلْبَةٍ كأنّي انظُرُ إلَيْهِ انحَدَرَ في الوادي.

### تەرجەمە

٨٥٢: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەما ابراهیم دەربارەی شکل و شێوەی لەش و لاری (قیافەت) وەکوو هاوڕێکەتانە «یەعنی شکل و قیافەتی من چلۆنە ئەویش وایە». وە ئەما موسێ سەلامی

خوای لێ بی بەدەنێکی بەگۆشت و توندی هەبوو ڕەنگ ئەسمەر بوو (جەعد لێرە مەعنای وایە بەمەعنا موویی بەگلوازە نی‌یە). لەسەر ڕای ئەوانەی بوخاریان شەرح کردووە. لەسەر ووشترێکی سووری لغاوکراو بەپوشی خورما گۆیا تەماشای دەکەم هاتە خوارێ لەوادی ئەزرەق بەگوتنی (لبیک لبیک) کردن.

٨٥٣: عن أبي هُرَيْرةَ (ض) إخْتَتنَ إبْراهيمُ عليه السلام وهو ابنُ ثمانينَ سَنَةً بالقَدوّمِ وفي روايةٍ بالقَدومِ مُخَفَّفَةً.

## تەرجەمە

٨٥٣: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی ابراهیم لەتەمەنی هەشتا سالی خۆی سونەت کرد لەگوندی قەدوم بەتەوشووی نەجار. ئێش و ئازاریشی زۆربوو خودای گەورە وەحی بۆنارد. پەلەت کرد ئارامت نەگرت هەتا ئالەتی سونەت کردنم (ختان) پێ دەگوتی گوتی ئەی خودایە پێم ناخۆش بوو فەرمانی تۆ دوا بخەم.

(ش) لەفظی قەدووم -نێوی گوندێکە لەشام بەلام (قەدوم) کە بەسووکی بگوترێ بەواتەی تەوشووی نەجارە لەبەر ئەوەی هەردوو ڕیوایەت ڕاستن بۆیە لەسەر هەردوو ڕیوایەت تەفسیرکرا.

٨٥٤: عَن أبي هُرَيْرَةَ (ض) لَمْ يكذبْ إبراهيمُ عَلَيهِ السَّلام إلاّ ثلثَ كَذَباتٍ ثِنْتَيْنِ مِنْهُنَّ في ذاتِ اللّهِ عَزَّوَجَلَّ قولُهُ إنّي سقيمٌ. وقولُهُ بَلْ فَعَلَهُ كبيرُهُم هذا. وقالَ بَيْنا هُوَ ذاتَ يَوْمٍ وسارَةُ إذْ أتى على جَبّارٍ من الجَبابِرَةِ. فقيلَ إنَّ هاهُنا رَجُلاً مَعَهُ إمرَأَةٌ مِن احسنِ النّاسِ فارسَلَ اليهِ فَسَألَهُ عنها. قالَ مَنْ هذهِ. قالَ اُخْتي فأتى سارَةَ وذَكَرَ باقي الحديثِ.

## تەرجەمە

٨٥٤: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی قسەی نەگوتووە ابراهیم سەلامی خوای لێ ی بەشێوەی درۆ سێ قسە نەبێ. دوو قسەیان تەنیا لەبەر زاتی خودابوو هیچ مەبەستێکی خۆی تیا نەبوو (یەکیان) وەکو ئەتەوەی خۆی لێ‌یان داواکرد لەگەڵ ئەوان لەپەرستگا بچنە دەرەوە گوتی من ئەساغم پێم ناکرێ بۆ دەرەوە بێم

(چونکی فکری وابوو بوتەکان بشکێنی وەکوو ئەوان ڕۆیشتن). (دووەم) وەکوو بوتەکانی شکاند بوتە گەورەکە نەیێ کە لەژێر بوو. پێیان گوت [ءَأنتَ فَعلْتَ هذا بِآلهتنا یا ابراهیم] واتە تۆ ئەم خوایانەی ئێمەت والێکردووە ئەی ابراهیم؟ ئەویش لەوەلامی گوتی: بەلکی بوتە گەورەکە ئەمانەی شکاندووە ئەمەش لەڕاستیدا بەدرۆ وای نەگۆت بەلکی بە تەعریفێکی بەلیغ نسبەتی شکاندنی وەبال خۆیدا لەگەڵ گالتەکردن بەوان چونکی کەسێک توانای هەبێ کارێک بکاو کارەکەی خستە ئەستۆی یەکێک کە توانای کردنی ئەم کارەی نەبێ. اسپاتە بۆخۆی و گالتە پێکردنە بەوان. بۆ وێنە: نووسەرێکی باش شتێکی جوان بنووسی. نەزانێکیش پێی بلێ ئەرێ تۆ ئەمەت نووسیووە. نووسەرەکەش بلێ ناتۆ نووسیوتە. واتە هەی نەزان لێرە هەرمن و تۆ هەین تۆش نەزانی نووسین نازانی ئەدی ئەگەر من ئەم نووسیبی کێ نووسیویەتی دیارە هەرمن نووسیومە (ئەمە زومەخشەری وای گوتووە).

(سێیەم) پێغەمبەر (د) فەرمووی لەزەمانێک ئیبراهیم و سارە ڕۆژێک بەلای یەکێک لەپاشایاندا ڕەت بوون. پاشای مصر بوو زۆر غەددارو زالم بوو. خەبەر بەپاشا درا پیاوێک هاتووتە ئێرە. ژنێکی لایق و جوانی لەگەلدایە. ناردیە شوێن ئیبراهیم گوتی ئەم ژنە چیە لەگەڵ تۆیە؟ گوتی خوشکمە (یەعنی لەدین). یاخۆ ئیرادەی کرد بەم قسەیە یەک لەدوو زەرەران لەخۆی دوورخاتەوە بەکردنی سووکەکەیان. چونکی داگیری هەر دەکرد بەهەر صورەتێک هەر داگیری دەکرد ئنجا ئەگەر بیگوتایە ژنی منە ترسی لەخۆی هەبوو بیکوژێ. چونکی غیرەتی بەینی ژن و مێرد گەورەترە لەغیرەتی بەینی براو خوشک چونکی لەوانەیە برا خوشکی خۆی بەمێرد بدا پاشان ابراهیم چۆوە لای سارە گوتی من بەپاشام گوتووە ئەمە خوشکمە من بەدرۆ مەخەوە. ئنجا باقی حەدیث لەمەپێش ڕەت بوو بەم تەرزە وەکوو سارەیان بردە لای پاشا سێجار دەستی بۆ درێژ کرد لەهەر جارێک دەستو قاچی پاشا ڕەق دەبوو هیچی لەگەڵ پێ نەدەکرا. ڕجای لەسارە دەکرد دوعای بۆ بکا چاک بێتەوە کە دەخلی نەکا بەکورتی بەسەلامەتی وە بەتەواوی ڕێزگرتن جاریەکیشی پێدا -ناوی- هاجەر- بوو- ڕەوانەی لای ابراهیمی کردەوە.

٨٥٥: عَن امّ شريكٍ اَنَّ النبيَّ صلّى اللّهُ تعالى عَلَيْه وسلّم اَمَر بقتل الوَزَغِ. وكانَ ينفَخُ على ابراهيمَ عليه السلام.

### تەرجەمە

٨٥٥: دەگێڕنەوە لەنومی شریک کە ناوی (غوزەیەی عامریە) بوو. ڕەزای خودای لێ بی. بەڕاستی پێغەمبەر (د) فەرمانی کرد بەکوشتنی قومقمۆک (ئەگەرچی لەمەپێش ئەمەندە ڕەدبووە بەڵام لێرە ئەمەندە زیادە. حالی قومقمۆک (یان پیس پیسۆک) فووی دەکردە ئاگری ابراهیم سەلامی خوای لێ بی وەکوو نەمروود ختسیی‌یە نێو ئاگر هەتا زیاتر ئاگرەکە گەش بی.

## باسی چیرۆکی ابراهیم و اسماعیل

(بۆ زانینی ئەو حەدیثانەی کە دەرحەق بە ابراهیم و اسماعیل وارد بووە لازمە فەرموودەی ابن عەباس بەتەواوی بنووسرێتەوە گۆیا بۆ زیاتر زانین پێشەکی‌یەکە).

دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خودای لێ بی گوتی یەکەم کەس لەئافرەتان کە تەکبەندی هەلبژارد دایکی اسماعیل بوو سەلامی خوای لێ بی کە ناوی هاجەر بوو باوکی لە پاشایەکانی (قبط)بوو چونکی وەکو اسماعیل لەدایک بوو سارە خاتوون غیرەتی هەلی نەگرت لەپێش چاوی بی. هاجەریش بۆ گورج بوونی پشتی خۆی بەست دامەنی کراسیشی لەسەر عارد ڕاکێشا بۆ شوێن بزر بوون. لەهاجەرەوە بووە عادەتی ژنی عەرەب کراسی‌یان درێژکەن هەتا سەر عارد لەپاشان حەزرەتی ابراهیم سەلامی خوای لێ بی هاجەری هەلگرت بەبوراق لەگەڵ اسماعیل کەلەبەر مەمکی بوو بۆ مەککە لەلای (بەیت) لەکن دارێکی گەورە لەسەر زەمزەم لەسەرەوەی مزگەوتی دانان. ئەو کاتەش لەمەککە هیچ کەسێک نەبوو. هیچ ئاویشی نەبوو. جێگای کەعبەش تەپۆلکەیێکی سووربوو. هەمبانە خورماییکو دێمکە ئاوێکی لەلا دانان پاشان ابراهیم گەڕاوە بۆ شام بۆ مالی خۆی. دایکی اسماعیل کەوتە شوێنی گوتی ئەی ابراهیم تۆ بۆ کوێ دەچی وە ئێمە جێ دێلی لەم جێگایە چۆلە. چەندجار وای پێ گوت هیچ ئاوڕی لێ نەدایەوە. پاشان پێ‌ی گوت خودا ئەمری پێ‌کردووی. ابراهیم گوتی بەڵێ: هاجەر گوتی کەوایە خودا ئێمە نافەوتێنێ. خودا بۆ ئێمە بەسە. ئنجا ابراهیم ڕۆیشت هەتا گەیشتە ئەنیە کە لەسەرەوەی مەککە یە هیچ کەسی لێ دیارنەبوو گوتی (ربِّ إنّي أسكنتُ من ذريّتي بوادٍ غير ذي زرع عند بيتكَ المحرّم هەتا.... يشكرون).

هاجەریش (اسماعیل)ی مەمکدەداو ئاوەکەشی دەخواردەوە. هەتا دێمکە ئاوەکە تەواو بوو خۆی و کوڕەکەی تینوویوون هاجەر تەماشای کرد کوڕەکەی دەگەوزی لەعارد. زمان و نێوی دەجوولان گۆیا ڕوح دەدا. هاجەر کەوتە تەنگانەیەکی زۆر، پێ‌ی نەکرا بەم هەیئەتە

تەماشای کوڕەکەی بکا هەڵستا چاوی بەکێوی صەفا کەوت کە لە کێوەکانی تر، لەو نزیکتر بوو چوو لەسەری ڕاوەستا. ڕووی لەبیابان کرد بەڵکی چاوی بەکەسێک بکەوی هیچ کەسی نەدی پاشان هاتە خوارێ لەصەفا. دامەنی کراسی هەڵکرد ندوەک پیێی تێ بالێ. وەکو انسانێکی زۆر ماندوو شەکەت غاریدا هەتا شیوەکەی بڕی گەیشتە کێوی مەڕوە لەسەر ئەویش ڕاوەستا تەماشای کرد بەڵکی کەسێک دەبینی هیچ کەسی نەدی. لەئەنجام هەفت جار لەبەینی صەفاو مەڕوە ئەم هاتوچۆیەی کرد. «ئنجا گەیشتینە سەر حەدیث».

٨٥٦: عَن ابن عباس فلذلِكَ سعيُ الناسِ بينَهما.

## تەرجەمە

٨٥٦: دەگێڕنەوە لەکوڕی عەباس ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر (د) فەرمووی لەبەر هاتوچۆی هاجەر حەوت جار لەبەینی صەفاو مەڕوە. عالەمیش هاتوچۆ دەکا پاشان وەکوو لەمەڕوە بەدیارکەوت جاری دوایی گوێی لەدەنگێک بوو. خۆی بەخۆی گوت ووس. پاشان گوێی بۆ ڕاگرت. دەنگەکی گوێ لێ بوو. هاجەر گوتی ئەوا گوێم لێیە ئەگەر لەهانام بێی. پاشان لەناکاو چاوی پێ کەوت. جوبرائیل سەلامی خوای لێ بی لەجێگەی زەمزەم بەپاژنەی خۆی عاردی قۆرکردووە وە ئاوی لێ پەیدابوو. هاجەریش بەدەست بۆ ئاوەکە هەر خەریک بوو حەوزێک پەیدا بکا. خۆی بەخۆی دەگوت ئاوا قۆری بکە ئاوا بیکە بەحەوز. بەمست ئاوی هەڵدەگرت ئاوەکەیش بەخۆشی دەهاتە دەرێ لەپاش گۆلم لێدانی (ئنجا گەیشتینە سەر حەدیث).

٨٥٧: قال النبيُّ صلى الله تعالى يرحم اللّٰه أُمَّ إسماعيلَ لَوْ تركَتْ زَمْزَمَ. او قالَ لَوْ لَمْ تَغْرِفْ مِنَ الْماءِ لكانَتْ زَمْزَمُ عَيْناً مَعيناً.

## تەرجەمە

٨٥٧: کوڕی عەباس گوتی - ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی خودا ڕەحم بەدایکی اسماعیل بکا. گەر وازی لەزەمزەم بهێنایە. یاخۆ فەرمووی. ئەگەر گۆلی لەئاوەکە نەدابوایە ئاوی زەمزەم لەسەرعارد دەڕۆیشت نەدەبووە بیر. ئنجا هاجەر لەئاوەکەی خواردەوەو مەمکی بەمناڵەکەی دا. پاشان جبریل پێی گوت ئێوە مەترسێن نەتۆ نە نەوەی

اسماعیل کە بە فیرۆ بچی. خانووی خودا لێرەیە. ئەم کوڕە خۆی و باوکی ئەم خانووە دروست دەکەن. خودا خەلکی ئەم خانووە بەهیلاک نادا. کەعبەش بەرز بۆوە لەعەرد وەکوو تەپۆلکە لافاوی. باران ئەگەر ڕاست و چەپی دەگرت بەلام بەرزایی خۆی چەسپاو بوو ئنجا هاجەر لەسەر ئەم حالەتە دەوامی کرد. لەجیاتی خواردن و خواردنەوە بەئاوی زەمزەم دەژیا. هەتا کاتێک عەشیرەتی کۆچەری (جورهوم) کە یەمەنی بوون. لەرێگای (گەدائەوە) کە لەسەرەوەی مەککەیە. هاتن لەخوارەوەی مەککە دابەزین وەکو دیتیان. تەیر بەشێوەیەک دەگەڕان و هاتوچۆیان دەکرد – هەروەکوو ئاو هەبێ لەم ناوە. گوتیان ئەم تەیرانە لەسەر ئاوێک دەورە دەکەن. لەمێژیش نی‌یە ئێمە هاتووینە ئەم ئەتراف و ناوە هیچ ئاو نەبووە قاصدێک واتە یەکەکیان نارد یان دووکەس بۆ زانینی هەبوونی ئاو. ئاویان دۆزیەوە گەڕانەوە خەبەریان دا ئاو هەیە. قەومەکە بۆسەر ئاو هاتن دیتیان دایکی اسماعیل لەسەر ئاو بوو پێ‌یان گوت ئیزن دەدەی ئێمە لای تۆ دابەزین گوتی بەڵێ: بەلام ئێوە هیچ حەقتان بەئاو نی‌یە یەعنی ئاوەکە عائد بەمنە. ئنجا گەیشتە سەر حەدیث.

٨٥٨: قالَ النبيُّ صلى الله تعالى عليه وسلم. فألْفى ذلِكَ امَّ إِسماعيل وهي تُحِبُّ الأُنْسَ.

## تەرجەمە

٨٥٨: کوڕی عەباس گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی قەومی جورهوم دیتیان دایکی اسماعیل پێ‌ی خۆشە ئەنیس و جیرانی هەبێ لەم چولاتی و بێ ڕەفیقیە دەرچێ.

ئنجا ئەوان لەوێ دابەزین و مانەوە. ناردیشیان چەند تیرەی تریش لەجورهوم هاتنە مەکە. هەتا چەند تیرەی جۆربەجۆر لەوێ کۆبوونەوە اسماعیلیش گەورە بوو وەکو بلوغی بوو لەوان باشتر فێری عەرەبی بوو وە لەجوانی و ریکی و لێ وەشاوەیی لەوان لێ وەشاوەترو جوان تر بوو ژنێکیان لەخۆیان لێ مارەکرد دایکیشی هاجەر وەفاتی کرد. لەپاش ژن هێنانی اسماعیل ابراهیم بۆ زانینی ئەحوالی یان هاتە مەککە اسماعیل لەماڵ نەبوو لەژنەکەی پرسی اسماعیل لەکوێ‌یە گوتی: بۆ ڕاو چووە ڕزقێک پەیدا بکا پاشان پرسی ئەحوالتان چلۆنە ژنەکە گوتی ئێمە بەشەرین زۆر لەتەنگاوەین زۆر نارەزایی دەربری. ابراهیم فەرمووی وەکوو مێردت هاتەوە سەلامی پێ بگەینە پێ‌ی بلێ عەتەبەی دەرگەی بگۆڕی. وەکو اسماعیل هاتەوە بۆنی باوکی خۆی لەمالی خۆی هەست پێ کرد بەژنەکەی گوت هیچ کەس هاتووتە ئێرە.

گوتی بەڵێ: پیرەمێردێکی بەم تەرزەو بەم ڕەنگە هات لەتۆی پرسی لەمن. منیش گوتم بۆ پەیداکردنی ڕزقێک بۆ ڕاو چووە پاشان پرسی ئەحوالتان چۆنە گوتم زۆر پەرێشانین هیچمان نییە. اسماعیل گوتی هیچ قسەی ڕانەسپارد. گوتی با. فەرمانی پێ کردم سەلام بە اسماعیل بگەیەنە. عەتەبەی دەرگەی خۆی بگۆڕی. اسماعیل گوتی ئەمە باوکم بوو ئەمری پێ کردوومە من تۆ طەلاق بدەم. ئنجا هەلستە بڕۆوە مالی باوکی خۆت. ئنجا ئەوی تەلاق دا ژنێکی تری هێنا لەپاش چەند وەقتێکی جارێکی تر ابراهیم بەسەر لێدان تەشریفی هێناوە مەککە. دووبارە اسماعیل لەمال نەبوو. چونکی بەڕۆژ ئیشو کاری هەر ڕاو بوو لەئەحوالی اسماعیل لەژنەکەی پرسی. ژنەکە پێی گوت بۆ پەیداکردنی ڕزقێک بۆ ڕاو چووە فەرمووی ئەحوالتان چۆنە. ژنەکە گوتی ئەحوالمان زۆر باشە زۆر لەخۆشیداینە سوپاس و ستایشی خودای کرد. ابراهیم فەرمووی خواردنتان چیە گوتی گۆشت نێچیرە گوتی ئەدی خواردنەوەتان چیە گوتی ئاوە. ابراهیم گوتی یاخودا گۆشت و ئاویان بۆ بگێڕی بەخێرو سوود (لێرە گەیشتینە حەدیث).

٨٥٩: قال النبيُّ صلى الله تعالى عليه وسلم وكَمْ يَكُنْ لَهُم يومَئذٍ حَبٌّ ولَوكانَ لَهُمْ دعا لَهُم فيه.

### تەرجەمە

٨٥٩: پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەو وەقتە هیچ دانەوێلەیان نەبوو ئەگەر دانەوێلەیان هەبوایە دوعای دانەوێلەشی بۆ دەکردن. ئنجا لەبەر دوعای ابراهیم سەلامی خوای لێ بی کوڕی عەباس فەرمووی هیچ کەسێک بەردەوام نابی لەسەر ئاوو گۆشت لەغەیری مەککە کە تووشی نەخۆشی و زگ ئێشان نەبێ - مەگەر لەمەککە نەبێ: بەلام لەمەککە لەسەر خواردنی گۆشت و ئاو بەردەوامیش بێ تووشی زەرەر نابێ.

پاشان ابراهیم بەژنەکەی گوت سەلام بە اسماعیل بگەینە پێی بلێ ئاگاداری عەتەبەی دەرگەی خۆی بی. وەکو اسماعیل هاتەوە گوتی هیچ کەس هاتووتە ئێرە گوتی بەلێ: شێخێکی هەیئەت شیرین و بەهەیبەت پسیاری تۆی کرد لەمن منیش خەبەرم پێدا پاشان گوتی ئەحوالتان چۆنە گوتم ئەحوالمان زۆر باشە پاشان قسەیەکیشی ڕاسپاردووە فەرمووی سەلام بە اسماعیل بگەیەنە ئاگاداری عەتەبەی مالی خۆی بێ. اساعیل گوتی ئەمە باوکم بووە. عەتەبەی خانووش ئەتۆی فەرمانی پێ کردوومە تۆ تەلاق نەدەم زۆر لای من بەشەرەف و بەقەدر بی ئنجا ئەو ژنە دە کوڕی لەحەزرەتی اسماعیل بوو گوتراوە ئەم

خێزانەی اسماعیل ناوی -ڕەعلە- بووە. کچی مەحنامی کوڕی عەمری جورهمی بوو گوتراویشە ناوی سامەی کچی موهەلهەل بووە گوتراویشە ناوی بەشامەی کچی موهەلهەلی کوڕی سەعدی کوڕی عەوف بوو گوتراویشە ناوی - عاتیکە- بووە.

پاشان ابراهیم ئەوەندە ماوەی کەخوودا ئیرادەی لەسەر بوو ئارامی گرت نەهاتەوە لایان لەپاشان لەپاش ئەو ماوەیە ابراهیم هات دیتی اسماعیل باسکە تیرێکی ڕێک دەخست لەژێر دارێکی گەورە لەنزیک بیری زەمزەم وەکوو چاوی بەباوکی کەوت بۆلای چوو چاکوخۆشی کرد دەستی ماچ کرد و دەستی یان لەملی یەک کرد پاشان گوتی ئەی اسماعیل خودای گەورە بەکارێک فەرمانی پێ کردوومە گوتی ئەوی خودای تۆ فەرمانی پێ کردووی بیکە. ابراهیم گوتی تۆش یاریدەم بدە. گوتی یاریدەت دەدەم. گوتی خودا فەرمانی پێ کردوومە. من لێرە خانوێک دروست بکەم ئیشارەی وەباڵ تەپۆلکە بەرزەکەی سور کرد کە ناوی باران دەورویشتی قۆزکردبوو وەکو وای گوت ابراهیم و اسماعیل بناغەی دیواری کەعبەیان بلند کرد. اسماعیل بەردی بۆ دەهینا ابراهیمیش دیواری دەکرد. هەتا دیوارەکە ئەمەندە بلند بوو لەعارد دەستی نەدەگەیشتە سەر دیوار. ئنجا اسماعیل ئەم بەردەی مەقامی بۆ هێنا ابراهیم لەسەر ڕاوەستا دیواری دەکرد اسماعیلیش بەردی پێ دەدا دەشیانگوت هەردویان [رَبَّنا تقبل منّا اِنّكَ انتَ السميع العليم].

٨٦٠: عَن اَبي ذرٍّ (ض) قالَ قُ يارسول الله ايُّ مسجدٍ وُضِعَ في الارض اَوّلَ قالَ المسجدُ الحرامُ قالَ قُلْتُ ثمّ اَيُّ قالَ المسجد الاقصى قُلْتُ كم كانَ بينهما قالَ اربعونَ سنَةً ثمّ اينما ادركَتْكَ الصلاةُ بعدُ فصلِّهِ فانّ الفَضْلَ فيه.

## تەرجەمە

٨٦٠: دەگێڕنەوە لەئەبو ذەری غفاری (ڕەزای خوای لێ بی) گوتی بەپێغەمبەرم گوت (د) گوتم ئەی پێغەمبەری خودا لەپێش هەموو شتێک کامە مزگەوتێک بوو دانرا لەسەر عارد فەرمووی مسجد الحرام (یەعنی کەعبە). گوتی پێم گوت: پاشان کامە. فەرمووی مسجد الاقصی (یەعنی بیت المقدس) پێم گوت ماوەی کات لەبەینی هەردوو بنایان چەند بوو. فەرمووی چل ساڵ لەپاش ئەم دوو مزگەوتە لەهەر جێگایەک نوێژبوو نوێژی خۆت بکە گەورەیی لەکردنی نوێژە هەموو عارد بۆتۆ مزگەوتە. گوتراوە لەهەموو دونیا خانوێک لەکەعبە بەشەرەفتر نی‌یە چونکی ئەوی فەرمانی بەدروست کردنی کردووە خودایە ڕاگەێنەرو ئەندازیاری جبرائیل ئەمینە سەلامی خوای لێ بی. وەستای بنایەکەی

خۆشەویستی خودایە. خەلفەو بەردەستی کەری لەکاتی دروست کردن اسماعیل کوڕی ابراهیمە سەلامی خوایان لێ بی وەکوو دروست کردنی کەعبە تەواو بوو. حەزرەتی جویرائیل ڕێوشوونی حەجی هەموو بە ابراهیم گوت. پاشان ابراهیم لەسەر بەردی مەقام ڕاوەستا بانگی کرد ئەی خەلکینە وەرن بۆ بانگی خودای خۆتان پاشان ابراهیم و اسماعیل ڕاوەستان لەعەرەفەو جێگاکانی تری ڕاوەستان. حەزرەتی سارا خاتوونیش لەشامەوە هات هەموو یان ئەو سالە حەجی خۆیان کرد بەیەکەوە دووبارە گەڕانەوە بۆ شام لەوێ هەردوویان چوونە (دار النعیم) سەلامی خوایان لێ بی «امِتْنِي علی طاعتِكَ ورضاك بجاههم عندكَ یا ارحم الراحمین». واتە خودایە بمان مرێنە لەسەر خواپەرستی و رازی بوونی خۆت لەبۆ خاتری ابراهیم و اسماعیل و سارە خاتوون ئەی لەهەموو کەس بەمیهرەبان تر. ئەمە دوعای دانەری ئەم پەرتووکەیە.

**٨٦١: عَن اَبي حميدٍ السّاعِديّ. قولوا اللّهُمّ صلّ علی محمدٍ وأزْواجِهِ وَذُرّیّتِهِ کما صلّیْتَ علی آلِ إبراهیم وَبارِكْ علی مُحَمّدٍ وأزْواجِهِ وذرّیّتِهِ کما بارَکْتَ علی اِبراهیمَ اِنّكَ حمیدٌ مجید.**

**تەرجەمە**

٨٦١: دەگێڕنەوە لەئەبووو حەمیدی ساعدی کەناوی عبدالرحمن بوو (ڕەزای خودای لێ بی) ئەصحابەکانی پێغەمبەر (د) بەپێغەمبەریان گوت ئەی پێغەمبەری خودا چلۆن صەلەوات لەسەرە تۆ لێ بدەین فەرمووی بلێن اللهم صل علی محمد وأزواجه...الخ.

**٨٦٢: عَن اِبنِ عبّاس (ض) اِنّ اباکُما کانَ یَعوذُ بِها اسماعیلَ واِسحاقَ أعوذُ بِکَلِماتِ اللّهِ التّامّةِ. مِنْ کُلّ شَیْطانٍ وَهامّةٍ ومِنْ کُلّ عَیْنٍ لامّةٍ.**

**تەرجەمە**

٨٦٢: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) دوعای پاراستنی لەسەر حەسەن و حسین دەخوێند. دەشی فەرموو باوکتان یەعنی باپیرە گەورەتان کە ابراهیمە بۆ اسماعیل و اسحاق بۆ پاراستنیان ئەم دوعایەی بەسەردا دەخوێندن دەیگوت ئێوە دەپارێزم بەموتلەقی بەتەواوی قسەی خودای پیرۆزو بەسوودو شافی و کاملی خودا لەهەموو شەیتانیکو حەیوانێکی بەژەهر و هەموو چاوێکی پیس.

(ش) **تامّة وهامّة ولامّة** بەتاو بەهای ساکنە هاتووە.

٨٦٣: عَن أَبى هريرةَ (ض) نحنُ أَحقُّ مِنْ إبراهيمَ إذْ قالَ رَبِّ ارني كَيْفَ تُحي الموتى. قالَ اولَم تُؤمِن قالَ بَلى ولَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلبي. ويَرْحَمُ اللّهُ لوطاً لَقد كان يأوي إلى رُكْنٍ شَديدٍ ولَو لَبِثْتُ في السِّجْنِ طولَ مالبِثَ يوسُفُ لأجَبْتُ الدّاعي.

## تەرجەمە

٨٦٣: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی بە تەواضع و شکاندنی خۆی. ئێمە لایق تر بووین شکمان هەبێ لە تەواوی تەوانایی خودا لە ابراهیم سەلامی خوای لێ بی (وەکو چاوی بەکەلاکی کەرێک کەوت لەدەم بەحر فرە درابوو. لێشی وورد بۆوە ئەم کەلاکە لەکاتی هەلچوونی دەریا -حیەواناتی دەریا ئەی خۆن. لەکاتی هاتنەخوارەوەی دەریا حەیواناتی دڕندەی عاردی ئەی خۆن لەپاش ئەوانیش مەل (تەیر) ئەی خۆن و ئەفڕن گوتی ئەی بەخێوکەری من. نیشانم بدە چلۆن تۆ مردوو زیندوو ئەکەیتەوە. خودای گەورەش فەرمووی چما (١) تۆ باوڕناکەی کەمن تەوانام لەسەر زیندوو کردنەوەی مردوان و لەسەر هەرچی ئیرادەش بکەم گوتی بەلێ: باوڕ دەکەم بێ شک و گومان کە تۆ مردوان دووبارە زیندوو دەکەیەوە» بەلام حەزدەکەم بەچاوی خۆم ببینم هەتا دلم ئارام بگری لەژێر حوجەتی بورهانی و حوجەتی عەیانی جوولانەوەی پێ نەکرێ».
نووطیش ڕەحمەتی خودای لێ بی حالی وابوو لەهەموو ناخۆشی‌یەک اعتمادی هەر لەسەر پاراستنی خودابوو. کەچی لەکاتی مەلائکەی لێ میوان بوون بۆ لەناوبردنی قەومەکەی: گوتی کاشکی خۆم پاراستنی میوانەکانی خۆم پێ بکرابایە لە قەومی خۆم. یا پەنام بردایە بەر هێزدارێک بۆ پاراستنیان وە ئەگەر من دەوامم بوبایە لەحەپسخانەی ئەوچەند سالانەی کە یوسف دەوامی تیاکرد جێ بەجێ بەقسەی ناردراوی پاشام دەکرد ئەهاتمە دەرێ لەحەپسخانە (وەکو یوسف ئەم دەگوت [إرجِعْ الى ربِّكَ فاسئَلْهُ مابالُ النِّسْوَةِ. اللاتي

---

(١) (ش) حەزرەتی ابراهیم سەلامی خوای لێ بی کە بەخودای گوت دەلێ: آرنی کیف تحیی الموتی؟. لەبەر شک نەبووە ئیمامی شافعی لەمەعنای ئەم حەدیثە فەرموویتی شک دەرحەق بە ابراهیم سەلامی خوای لێ بی موستەحیلە چونکی ئەگەر بۆ شک ڕێگا هەبوایە بۆ سەر پێغەمبەران من لایق تر بووم شکم هەبێ لە ابراهیم دیاربوو لەبەیانی قسەی خودا! ابراهیم شکی نەبوو. منیش هیچ شک و شوبهەم نی‌یە لەسەر تەوانای خودای گەورە لەسەر زیندوو کردنەوەی عالەم یەعنی بەبەلگە دەی هێنمەوە بەنەبوونی شکی خۆم کە ابراهیم سەلامی خوای لێ بی بە -طریق الاولی- هەندەی یەک ذەرە شکی نەبووە چونکی ئەو خۆشەویستی خودابوو- زۆر بەباوەڕبوو بەڕێزبوو باوکی چەند هەزار پێغەمبەربوو.

قَطَّعْنَ ايديَهُنَّ] پاشان بچمه لای پاشا بەلکی زوو لەزیندان ئەهاتمە دەرێ.
(ش) ئەمە مەدحە بۆ یوسف بەتالووکە نەکردنی بۆ نەجاتی لەزیندان یەعنی لەسەرە خۆو بەوقاریبوو». فەرموودەی پێغەمبەر لەم حەدیثە هەرسێ فەقەرە (بڕگە) لەبەر تەواضع بووە نەگەرنا بە دەلیلی ئایەتی [فـهداهم اقتده]. هەرچەند صفاتی چاکە ڕەووشتی باش لەهەموو پێغەمبەران هەبوو لەپێغەمبەر (د) مەوجود بوو.

٨٦٤: عَن سلَمَةَ (ض) إرموا بَني إسماعيلَ فانَّ اباكُمْ كانَ رامياً وَانا مَعَ بني فُلان. فأمسكَ احَدُ الفريقين بأيديهِمْ فَقالَ رسولُ اللّهِ صلى الله تعالى عليه وسلم مالَكُمْ لاتَرْمونَ فقالوا يارسولَ اللّهِ نَرمي وانتَ مَعَهُمْ قالَ أُرموا وانا مَعَكُمْ كلّكم.

### تەرجەمە

٨٦٤: دەگێڕنەوە لەسەلەمەی کوڕی ئەکوەع ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) بەلای چەند کەسانێک لە قەبیلەی ئەسلم دا ڕەت بوو تیریان -بەنیشان دەهاویشت بۆ موسابەقە. پێغەمبەر (د) فەرمووی تیرباوێن ئەی کوڕانی اسماعیل چونکی باوکتان بەڕاستی تیرانداز بوو وە منیش لەگەڵ فلان کۆمەڵ دام. کۆمەلەکەی تر ئیتر چیدی تیریان نەهاوێشت پێغەمبەر (د) فەرمووی بۆچی تیرناوێن گوتیان. ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە تیرباوێین تۆش لەگەڵ ئەواندایی. فەرمووی تیرباوێن من لەگەڵ هەمووتان دام. بە ئەولادی اسماعیل قسەی لەگەلیان کرد چونکی اسماعیل باپیرە گەورەیان بوو.

٨٦٥: عَن ابنِ عمر (ض) الكريمُ ابنُ الكريمُ ابنُ الكريمُ يوسفُ ابنُ يعَقوبَ ابن اسحاقَ ابنِ ابراهيمَ. عليهم السلام.

### تەرجەمە

٨٦٥: دەگێڕنەوە لەعبداللەی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی کەریمی کوڕی کەریمی کوڕی کەریمی کوڕی کەریم یوسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم بوو. سەلامی خوای لێ بی.
(ش) خاوەنی پەرتووکی (کەواکب) گوتیتی کەریم کەسێکە خێروچاکەی زۆربی حەزرەتی یوسفیش لەگەڵ ڕەووشتی باش و گەورەیی پێغەمبەرایەتی و پاشایەتی بە عەدل و چاکەی بە ڕەچەلەک کوڕی سێ پێغەمبەران بوو. سەلامی خوایان لێ بی.

٨٦٦: عَن أَبي هُرَيرَةَ (ض) إِنَّما سُمّيَ الخَضِرُ أَنَّهُ جَلَسَ على فَروَةٍ بَيْضاءَ فاذا هيَ تَهْتزُّ مِنْ خَلْفِهِ خَضْراءَ.

## تەرجەمە

٨٦٦: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی بەحەزرەتی (خدر) گوترا [خَضِر] چونكی دانیشت لەسەر عەردێكی ڕووتو بێ گیا پاشان لەناكاو دیتی لەپشت خۆی عەردەكە دەهەژێ لەگیاو سەوزایی.

(ش) ئەگەر نا ناوی -بەلیابۆ كوڕی مەلكان كوڕی فالغ كوڕی عامر كوڕی سالخ كوڕی ارفحنشذ كوڕی سام كوڕی نوح لە فەتح گوتیتی لەسەر ئەم اعتبارە لەدایک بوونی (خدر) لەپێش ابراهیم بووە چونكی ئەبێتە ئامۆزای باپیری ابراهیم سەلامی خوای لێ بی. لەپێغەمبەرایەتی (خضر) چەند ڕایەک هەیە لای هەندێكان بەدەلیلی گوتی [ومافعَلْتُهُ عَنْ أَمــري] پێغەمبەر بووە چونكی مەعنای وایە وەحیم بۆ هاتووە. وەلام دراوەتەوە لەلایەن ئەوانەی دەلێن پێغەمبەر نی‌یە دەلێن احتمال هەیە وەحی بۆ پێغەمبەری زەمانی خۆی هاتووە كە فەرمان بە (خدر) بكا ئەم ایشانە بكا كە لەسورەی -كەهف دایە. احتمالیش نابێتە دەلیل لەسەر ژیانیشی چەند ڕایەک هەیە. ئیمامی نەوەوی گوتیتی بەشی زۆری زانایان لەسەر یەک بوونی ڕای گەورەكانی مەزهەبی (صوفیە) وەكو ابراهیم كوڕی ئەدهەم وە بشیری حافی و مەعروفی كەرخی و سری سەقەطی و جونەیدو عمر كوڕی عبدالعزیز ماوە بەلام بوخاری بەوەفاتی -سوورە - جازمە- وەكو ابراهیمی حەربی و ابو بكر كوڕی عەرەبی و كۆمەلەیەک لەوانەی زانای حەدیش بەدەلیلی ئەم حەدیشەی ڕابردوو كە پێغەمبەر (د) لەدوایی ژیانی فەرمووی [لایبقی علی وجه الارض بعد مائة سنة ممن هو علیها الیوم أَحَدٌ]. بەلام وەلام دراوەتەوە لەكاتی گوتنی ئەم حەدیثە. خدر لەسەر بەحربوو. چەند وەلامی تریش لەمەپێش چونكی نووسراو رابورد زیاتر درێژە پێدان بێزاری پەیدادەكات. ئنجا لای قسەی ڕاست حەزرەتی (خدر) ماوە(١).

---

(١) بۆیە لەناو كوردەواری باوە (خدری) زندە واتە هەر زیندووەو ماوە.

٨٦٧: عن جابرٍ (ض) عَلَيْكُمْ بِالاسوَدِ فانَّهُ أطيبُهُ قالوا اكُنْتَ تَرعى الغَنَم قالَ وَهَلْ مِن نبيٍ اِلاّ وَقَدْ رَعاها.

### تەرجەمە

٨٦٧: دەگێرنەوە لەجابر ڕەزای خودای لێ بی. گوتی ئێمە لەخدمەت پێغەمبەر بووین لە - مر الظهران- بەری داری ئەراکمان دەچنی بۆ خواردن پێغەمبەر (د) فەرمووی. بەو ئەصحابانەی لەخدمەتی بوون کامەی ڕەشە لێ بکەنەوە. چونکی ڕەشەکە خۆشترە. گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا چما تۆ شوانیت کردووە (چونکی شوان ئاگادارترن لەجۆرەکانی بەری ئەراک). فەرمووی هەر پێغەمبەرێک شوانی کردووە.

(ش) هەتا لەبەخێوکردنی حەیوانات بچیتە سەر بەخێوکردنی انسان. بەشوانی نەفسی انسان فێری دل فرەوانی و خۆ بەگەورە نەزانی دەبی دلی ساف دەبی لەبەر ئەوەی زۆر لەچۆلی و بیابان دا دەمینێتەوە لەپێش ئەم حەیوانە بەستەزمانە.

٨٦٨: عَن اَبي موسى (ض) كَمُلَ مِنَ الرِّجالِ كَثيرٌ وَلَمْ يكْمُلْ مِن النِّساءِ اِلاّ اسيَةُ امرَاةُ فرعونَ وَمريَمُ بِنْتُ عِمران وَاَنَّ فَضلَ عائِشَةَ على النِّساءِ كفَضلِ الثَّريدِ على سائرِ الطعامِ.

### تەرجەمە

٨٦٨: دەگێرنەوە لەئەبو موسى عبدالله کوڕی قەیسی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی لەپیاوان زۆربوون بەانسانی تەواو لەژنان انسانی تەواو نەبوو ئاسیەی ژنی فیرعەون و مەریەمی کچی عمران نەبێ شەڕەف و گەورەیی عائشەیش لەسەر ئافرەتان وەکوو شەرەف و گەورەیی گۆشتاوو نانە یەعنی مەرەگەیە لەسەر خواردنەکانی تر.

(ش) دەگێرنەوە کە اجماع لەسەر نەبوونی پێغەمبەرایەتی لەژنان. بەلام لای ئەشعەری شەش ژن پێغەمبەر بووینە ١- حەووا. ٢- سارە. ٣- دایکی موسی (ناوی بوخابذ بووە). ٤- هاجەر. ٥- ئاسیا. ٦- مەریەم. دەلیلە کە مەلائکە هاتووتە لایان پیوەریش لای ئەو هاتنی مەلائکەیە بەحوکمێک لەفەرمانی کردن و نەکردنی شتێک یان ئاگادار کردن بەشتێک بۆ هەندێکیان قورئان باسی ایحا دەکا واتە خستنە ناو دل یان سرووش وەکو ئەم ئایەتەی فەرموویتی [واَوحيْنا الى امِّ موسى] . وە لەپاش باسی مەریەم و

پێغەمبەران قورئان فەرموویتی [أولئكَ الذينَ انعمَ الله عليهم مِن النبيينَ]. مەریەمیش لەگەڵ ئەم هەمووەیە. وە بۆ (اسیا) قورئان ڕاست و ڕاست ناڵێ بەڵام استدلال کراوە بەباس کردنی ئەم حەدیثەی کە ئاماژە (اشارە) دەکا بە -زۆر تەواوی- اسیا و مەریەم. بەم تەرزە تەواوترینی نەوعی انسان پێغەمبەرن پاشان ئەولیاو صدیق و شوهەدان. واتە خواپەرست و خوابەڕاست زان و شەهیدەکان. ئەگەر ئەم دووانە پێغەمبەر نەبن لازمدێ لەژنان وەلیەو صدیقەو شەهیدە نەبێ. کە لەڕاستیشدا ئەم صفاتانە لەزۆر ژنان مەوجوودە کەوایە [کأنَّهُ] حەدیث دەڵێ ئەگەیشتە پلەو روتبەی پێغەمبەرایەتی ئەم دووژنە نەبێ. چونکی ئەگەر ئەم حەدیثە حەصری صفەتی صدیقیەو ویلایەت و شەهادەتی بکردایە لەم دووژنە ڕاست نەبوو لەبەرئەوەی زۆر ژنی تریش ئەم صفەتانەیان هەبوو جگە لەم دووژنە. دەلیلی اجماعیش لەسەر قەدەغەبوونی پێغەمبەرایەتی لەژنان ئەم ئایەتەیە [وَما أرْسَلنا مِن قبلِكَ الاَّ رجالاً]. ئەمەش نابیتە بەڵگە چونکی مەبەست پێغەمبەرایەتی‌یە بەڵگەش ڕووی لەناردنە کەهیچ یەکیش لەم ژنانە داوای پێغەمبەرایەتیان نەکردووە [بەزاراوەی زاناکانی ئاداب و گفتوگۆ (مناظرە) بەم تەرزە دەلیلە دەڵێن بێ تەقریبە -واتە نزیک خەرەوە نی‌یە.

٨٦٩: عَن ابن عَباس (ض) ماينبغي لِعَبْدٍ أنْ يقول إنّي خيرٌ. من يونَسَ ابن متى.

**تەرجەمە**

٨٦٩: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خودایان لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی لێ وەشاوە نی‌یە بۆ هیچ بەندەیەک کە بڵێ من باشترم لەیونس کوڕی مەتا. (واتا یونس پێغەمبەر).

(ش): گوتراوە لەم حەدیثە بۆیێ یونسی تایبەت کردووە بەگۆتن لەبەر ترس لەکەسێک گوێی لەچیرۆکەکەی بێ نەوەک دەرحەق بەیونس نوقصانیەکی بچیتە دڵی. نسبەتی وەباڵ باوکی دا بۆ ڕەد لەسەر ئەوانەی کە دەڵێن مەتا دایکی بووە. مەبەستی پێغەمبەریش تەواضع بووە لەم قسەیە ئەگەر لەپاش زانینی بوویی کە هەر خۆی سید البشرە.

٨٧٠: عَن أبي هريرةَ خُفِّفَ على داودَ عليه السلام القرانُ فكانَ يأمُرُ بدَوابِهِ فتُسرَجُ فيقْرَءُ القرانَ قَبْلَ أنْ تُسْرَجَ دوابُّهُ ولا يأكُلُ إلاَّ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ.

## تەرجەمە

٨٧٠: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی سوکو ئاسان کرا بۆ داود سەلامی خوای لێ بی خوێندنی زەبوور بەم تەرزە فەرمانی دەکرد وولاغی سواری خۆی بۆ بێنن ئنجا وولاغەکەی زین دەکرا لەپێش زین کرانی وولاغەکەی بەتەواوی زەبووری دەخوێند وە نەشی دەخوارد لەکاری دەستی خۆی نەبێ.

(ش) ڕۆژی یەک زرێی دروست دەکرد دەفرۆشرا بەشەش هەزار. دووهەزار بۆخۆی و خێزانی چوار هەزاریش دەرخواردی ئیسرائیلیەکانی دەدا. قورطبی گۆتیتی زەبوور سەدو پەنجا سوورەتە هیچ ئەحکامی حەلال و حەرامی تیا نی‌یە جگە لە سوپاس و ستایش و ئامۆژگاری وە پاڕانەوە نەبێ ئاوازی زۆر خۆش بوو وەکوبی خوێندایە انسان و مەل و کیوی‌یەکانی بیابان گوێ یان دەدایە. ئەم حەدیثە بەڵگەیە کە خودای گەورە زەمانە درێژدەکاتەوە بۆ هەرکەسێک بی‌یەوێ هەر چلۆنێک شوینی‌یان بۆ نزیک دەکاتەوە. ئیمامی نەوەوی گۆتیتی لەئەولیا هەبوو ڕۆژی چوار خەتمی دەکرد بەشەویش چوار خەتم. ابو طاهر لەبیت المقدس شەوو ڕۆژ دەخەتمی زیاتر دەکرد. شیخ الاسلام کوڕی ئەبی شریف لەشەوو ڕۆژ یازدە خەتمی دەکرد. ئەمە دەرگا یێکە ڕێگا نی‌یە بۆ پێ گەیشتنی مەگەر بە بەرەکەتی خودا نەبێ لەحەدیث زەبووری تەعبیردایە بە قورئان چونکی کتابی هەر پێغەمبەرێک قورئانی ئەوە.

٨٧١: عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (مَثَلي وَمَثَلُ الناس كَمثَلِ رَجُلٍ اِسْتَوْقَدَ ناراً فَجَعَلَ الفَراشُ وَهذه الدّوابُّ تَقَعُ في النّارِ وَقالَ كانَتْ إمرَاَتَانِ مَعَهما ابناهُما. جاءَ الذِّئْبُ فَذَهَبَ بابنِ احدِهما فقالَتْ صاحِبَتُها إنّما ذَهَبَ بابنِكِ وَقالَتِ الاخرى إنّما ذَهَبَ بابنِكِ. فتحاكما الى داودَ فقَضى به للكبرى فَخرَجتا على سليمانَ ابنِ داودَ عليهما السلام فاخبرتاه. فقال اتوني بالسكينِ اَشُقُّهُ بينهما فقالتِ الصُّغرى لاتفْعَلْ يرحَمُكَ الله هو ابنها فقضى به لِلصّغرى.

## تەرجەمە

٨٧١: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی صفەتی من لەداواکردنی خەلکی بۆ ئایینی ئیسلام کە لەئاگر ڕزگاریان دەکا. لەگەڵ صفەتی ئەو کەسانەی کە مزەخرەفاتی دونیایان بۆ ڕازاوەتەوە وە خەریکی کاری پڕوپووچن وەکو صفەتی پیاوێکە ئاگرێکی هەل کردبێ لەشەوی تاریک دەورویشتی خۆی ڕۆناک

کردبێ ئنجا پەپوولەو حەیواناتی ووردیلە وەکو پێشکەو مێشوولە دەورەی لێ بدا وە لەبەر اکتفانەکردنیان بەڕۆناکی دەورپشتی ئاگرەکە لەبەر ویستنیان بۆ دەرچوونیان لەهەموو تاریکی شەو خۆیان بەڕاست و چەپی ئاگرەکە دادەدەن هەتا لەئاخری دەکەوتە نێو ئاگرەکە.

(ش) ئیمامی غەزالی فەرموویتی ئەم حەیواناتی چاویان کزو زەعیفە وەکو شەویان بەسەردا هات لایان وایە لەنێو هۆدەیەک دانە هیچ کونی نی‌یە تیا قورتار بن ئنجا وەکو چرا هەلکرا لایان وایە ئەمە کونێکە ڕۆناکیەکەش لەدەرەوەی هۆدەیە پەیتا پەیتا بۆ ناو ڕوناکیەکە هەوڵ دەدەن تا لەئەنجام تووشی ئاگرو سووتان دەبن لەبەر نەزانینی خۆیان. کەچی ئینسانی زۆر لەوان نەزانترە چونکی ئەوان بەهەولدانی خۆیان تووشی عەزابێکی دونیا دەبن جێ‌بەجێ دەڕوا بەلاّم انسان بەدرێژایی تەمەنی خۆی لەهەولدانی ئارەزووی نەفس دایە. هەتا تیا نقوم دەبی و تووشی عەزاب و سووتانی هەتا هەتایە دەبی بێ بڕانەوە ریوایەت کراوە گۆتیشی ئەبو هورەیرە لەزەمانی پێشوو دووژن هەبوون هەرکەسە کوڕێکی بچووکی خۆی لەگەڵدابوو گورگ هات کوڕێکی برد لەدوان یەکێک لەژنەکان بەژنەکی تری گوت ئەوی گورگ بردی کوڕی تۆبوو ژنەکەی تریش گوتی (نا) کوڕی تۆ بوو بۆ موحاکەمە چوونە لای داوود سەلامی خوای لێ بی ئەو کوڕەی کەمابوو دایە ژنە گەورەکە چونکی لەدەست ئەو دابوو. پاشان بۆلای سلیمان چوون هەرکەسی قسەی خۆی کرد. سلیمان گوتی کێردێکم بۆ بێنن هەتا منالەکەی ئەوەی کەماوە بیکەمە دووپارچە هەر پارچەیەک بۆ یەکێکتان. ژنە بچووکەکە گوتی وامەکە ڕەحمەتی خودات لێ بی کوڕەکە کوڕی ئەوە. ئنجا سولەیمان کوڕەکەی کە هەیە دایە ژنە بچووکەکە چونکی بەدەلیلی بەزەیی هاتنەوەی زانی کوڕی ژنە بچووکەکەیە گوێ‌ی نەدا دان پیانانی ژنە بچووکەکە.

٨٧٢: عَن عليٍّ (ض) خيرُ نسائها مريَمُ ابنةُ عمران وخير نِسائِها خديجَةُ.

### تەرجەمە

٨٧٢: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عەلی ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی باشترینی ژنی دونیا لەزەمانی خۆی مەریەمە کچی عمرانە وە باشترینی ژنانی نەتەوەی منیش خەدیجەیە دایکی ئیمانداران.

٨٧٣: عَن أَبي هريرَةَ. نساءُ قُرَيْشٍ خَيرُ نساءٍ رَكِبْنَ الأبِلَ أَحناهُ على طِفْلٍ وأَرْعاهُ على زَوْجٍ في ذاتِ يَدِهِ.

### تەرجەمە

٨٧٣: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی ژنی قورەیش باشترینی ئەو ژنانەن کە سواری ووشتر بوونە یەعنی باشترین ژنی عەرەبن بەرەحم و بەبەزەیی ترین جنسی ژنن بۆ منالی خۆیان وە بەموراعات ترین جنسی ژنن بۆ مێردی خۆیان دەربارەی ئەمانەت و پارێزگاری مالی مێردیان وە پاراستنی ئەسراری مێردیان.

٨٧٤: عَن عبادَةَ (ض) مَن شهِدَ ان لا الهَ الا الله وحْدَهُ لاشريكَ له وأنَّ محمداً عبده ورسوله وان عيسى عبدُهُ ورسولُهُ. وكلمتُهُ اَلقاها اِلى مريَمَ وروحٌ مِنْهُ. والجَنَةَ حَقٌ والنَارَ حَقٌ اَدْخَلَهُ اللّهُ الجنَةَ على ما كانَ مِنْ العَمَلِ.

### تەرجەمە

٨٧٤: دەگێڕنەوە لەعوبادەی کوڕی صامت ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی هەرکەسێک بەزمان بلێ وە بە دلیش باوڕ بکا کە هیچ پەرستراوی بەڕاستی نی‌یە خودا نەبێ کە یێکە هیچ هاوبەش و شریکی نی‌یە وە محمدیش بەندەی خودایە وە پێغەمبەری خودایە وە عیساش بەندەی خودایە وە پێغەمبەری خودایە و کلمەی خودایە بەمریەمی گەیاند (یەعنی بەئەمری خودا لەمەریەم بوو لەباوک نەبوو). وە ڕووحێک بوو لەلایەن خودا چونکی مردووی زیندوو دەکردەوە وە شاهیدیش بدا بێ شک بەهەشت هەیە و ئاگر هەیە خودا دەی خاتە نێو بەهەشتی خۆی لەسەر ئەو کارەی کە لەسەربووە یەعنی ئەگەر گوناهی گەورەشی کردبی لەسەر ئەم شاهیدیانەی هەتا هەتایە لەئاگر نامینێتەوە وەکوو (موعتەزیلە) دەلێن.

٨٧٥: عن اَبي هريرةَ (ض) لمْ يتكلم في المَهْدِ اِلاَّ ثَلَثَةٌ. عيسى وكان في بني اسرائيل رَجُلٌ يقالُ له جُرِيحٌ كانَ يُصلّي جاءَتْهُ اُمُّهُ فَدَعَتْهُ فقالَ اجيبُها او اُصلّي فقالَتْ اللّهمَ لاتُمِتْهُ حَتّى تُرِيَهُ وَجوهَ المومِساتِ وكانَ جُرَيْجٌ في صومَعَتِهِ فَتَعرَّضَت لَهُ اِمرَاةٌ تكلَّمَتْهُ فأبى فاتَتْ راعياً فامكنَتْهُ مِن نَفسِها فَوَلَدَت غُلاماً فقالَتْ من جُريح. فاتَوْهُ فكسروا صومَعَتَهُ وَ انزلوهُ وَسَبّوهُ فتوضأَ وَصلّى ثمَّ اتى الغُلامَ فقالَ مَنْ ابوكَ ياغُولام فقال الرّاعي قالوا نَبْني صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ قال لا اِلاَّ مِن طينٍ وكانت امرَاةٌ تُرضِعُ ابناً لها مِن بني اسرائيلَ فَمرَّ بها رَجُلٌ راكِبٌ ذو شارَةٍ فقالتْ اللهُمَّ اجعَلْ

ابني مِثْلَهُ. فتَرَكَ ثَديَها وأقْبَلَ على الرّاكِبِ فقالَ اللهُمَّ لاتَجعَلْني مِثْلَهُ ثمَّ اقبَلَ على ثديها يَمُصُّهُ ثمَّ مُرَّ بأمَةٍ فقالَتْ اللهُمَّ لاتَجعَلْ ابني مِثْلَ هذهِ. فترَكَ ثدَيَها. فقال اللهُمَّ اجعلني مِثلَها. فقالَتْ لِمَ ذاكَ فقالَ الرّاكِبُ جَبّارٌ مِنَ الجَبابِرَةِ. وهذه الأمَةُ يقولون سَرَقْتِ زَنَيتِ ولَم تَفْعَلْ.

### تەرجەمە

٨٧٥: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی ئەویش لە پێغەمبەر دەگێڕتەوە (د) بەم تەرزە فەرمووی هیچ منالێکی بچووک لەنێو لانک قسەی نەکردووە سێ کەس نەبێ یەکی‌یان عیسی سەلامی خوای لێ بی. دووەم لەبەنی اسرائیل پیاوێک هەبوو ناوی (جورەیج) بوو پەرستگایەکی بۆخۆی دروست کرد نوێژی تیا دەکرد. ڕۆژێک دایکی هاتە لای بانگی کرد ئەویش لەنوێژ دابوو. گوتی نازانم نوێژەکە ببڕم وەلامی دایکم بدەمەوە یاخۆ نوێژ بکەم. پاشان دایکی گوتی ئەی خودایە نەی کوژی هەتا ڕووی ژنانی فاحشەی نیشان دەدەی. (نەک بەزناکردن) جرەیحیش لە کلیسەی خۆی خەریکی خواپەرستی بوو ژنێک شوانی حەیوان بوو هاتەلای جورەیج قسەی لەگەڵ کرد کە تووشی زینای بکا جورەیج نەی کرد چووە لای شوانێک سواری خۆی کرد زگی بوو کوڕێکی بوو پێ‌یان گوت کێ سواری تۆ بوو گوتی جورەیج. خزمی ژنەکە شکایەتیان لای پاشا کرد. وە هاتنە سەر جورەیح. بەکولینگ و بێل و خاکەناسی کلیسەکەیان لێ تێک دا. جورەیحیان بەجنێوو سیاسەت دەرهێنا. جورەیج دەست نوێژی شووشت. دوو ڕکعەت نوێژی کرد چووەلای کوڕی ژنەکە (کە بیژی بوو) دەمی لەمەمک دابوو گوتی ئەی کوڕە باوکت کێ‌یە؟ وازی لەمەمک هێنا بەقسەهات گوتی باوکم شوانە (ناوی نەهێنا) وەکوو ئەم قسەیان لەم منالە بیست بۆلای جورەیج بەهەلاتن هاتن دەست و پێ‌یان ماچ کرد گوتیان پەرستگایەکت لەزێڕ بۆ دروست دەکەین. گوتی نا هەروەکوو پێشوو بۆم لەقوڕ دروست بکەنەوە. (سێ‌یەم) ژنێک هەبوو لەناو بەنی اسرائیل کوڕێکی لەبەر مەمک بوو پیاوێک بەسواری بەجلکەکی پۆشتەو جوان بەلای دا تێ پەڕی گوتی ئەی خودایە کوڕی من وەکوو ئەم پیاوە لێ بکەی. کوڕەکە دەمی لەمەمک بڕی دوعای لەسوارەکە کرد. گوتی یاخوا وەکو ئەم سوارەم لێ نەکەی. دووبارە ڕووی لەمەمک کردەوە مەمکەکەی دەمژی ئنجا لێرە ئەبو هورەیرە فەرموویتی من چاوم لێ بوو بۆ وێنەکێشانی مەمک مژینی کوڕەکە پێغەمبەر (د) ئەنگوستی پیرۆزی لەنێو دەمی خۆی نابوو پاشان ژنەکە بەمنالەکەوە تەصادوفی جاریەکی بەدناو هات کە ناسراویوو (بەدزو حیز). ژنەکە گوتی یاخوا کوڕەکەی من وەکو ئەم جاریە

لێ نەکەی. کوڕەکە دەمی لەمەمک کردەوە ڕووی لەجاریەکرد گوتی یاخوا وەکوو ئەم جارەیەم لێ بکەی. ژنەکە ووتی ئەمە بۆچی؟ کوڕەکە گوتی سوارەکە زاڵمێک بو لەپاشایانی کافر. ئەم جاریەش خەڵکی پێی دەڵێن دزیت کردووەو زینات کردووە کەچی نەدزی کردووە نەزناشی کردووە.

(ش) ئەوانی لەناو لانک قسەیان کردبی ئەگەر لەم حەدیثە هەرناوی سێ کەس هاتووە بەڵام بەحەدیثی تر ثابت بووە. پێغەمبەر (د) لەسەرەتای لەدایک بوونی وە ابراهیم و حەزرەتی موسی وە حەزرەتی یەحیا وە مەریەم وە شاهێدی حەزرەتی یوسف لەناو لانک قسەیان کردووە. زۆرکەسی تریش وەکوو منالی بەربوکی کچی فیرعەون. وەکو فیرعەون ویستی دایکەکەی بخاتە نێو ئاگر گوتی ئارام بگرە دایە ئێمە لەسەر حەقین. وە لەحیکایەتی (أخدود) وەکوو ژنێکیان هێنا گوتیان یا دەبی کافربی یا ئەتخەینە نێو ئاگر منالە مەمک خۆرەکەی گوتی دایە خۆت ڕابگرە تۆ لەسەر حەقی. وە بەیهەقی لە موعەیقیبی یەمانی ریوایەت کردووە پیاوێکی خەلکی یەمامە کە کوڕێکی لەدایک بوو هێنایە خدمەت پێغەمبەر (د) فەرمووی (یاغلام من انا؟) واتا ئەی کوڕە من کێم؟.

**«قال انت رسول الله»** گوتی تۆ پێغەمبەری خودای **(قال صدقت بارك الله فيك)** گوتی ڕاست دەکەی خودا پیرۆزت بکات. بۆیێ وەکوو گەورە بوو پێی گوترا (مبارەکی یەمامە) واتە پیروزی وولاتی یەمامە. بەڵام باس کردنی ئەم سێیە لەم حەدیثە چونکە ئەم سێیەی لەم حەدیثە هەیە لەلانک بووینە بەڵام ئەوانی ترکەباسمان کرد باسی لانک ناکا بۆیێ منافات ڕوونادات لەبەینی حەدیثەکانی پیرۆزی پێغەمبەر. چونکی ئەم سێیانەی مەوجود لەم حەدیثە. تایبەتن بەلانک لەوانی تر قەیدی لانک نامەعلومە واتە دیار نییە.

**٨٧٦: عَنَ ابن عمر (ض) رأيْتُ عيسى وموسى وابراهيمَ فأمّا عيسى فأحمَرُ جَعْدُ عريضُ الصدْرِ وأمّا موسى فآدمُ جسيمٌ سبطٌ كأنَّهُ مِن رجالِ الزُّطِّ.**

### تەرجەمە

٨٧٦: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودای لێ بی فەرمووی چاوم بە عیسی و موسی و ابراهیم کەوت. ئەما عیسی یەکێکی سوورو سپی موو بەگلوازەو سنگ بەرین بوو. وە ئەما موسی پیاوێکی ئەسمەرو درێژو ڕاکشاو بوو گۆیا لەپیاوەکانی سوودانە لەمەپێش ڕابوورا تەماشای من بکە تەماشای ابراهیم بکە یەعنی وەکوو من بووە.

٨٧٧: عَن أَبي هريرَةَ (ض) انا أولى الناس بابنِ مريَمَ والأنبياءُ أولادُ عَلاّتٍ لَيْسَ بيني وبينهُ نبيٌّ.

## تەرجەمە

٨٧٧: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی من بە مناسب ترینی کەسانم لەگەڵ حەزرەتی عیسی کوڕی مەریەم چونکی لەپێش وجودی من موژدە دەربوو بەهاتنی من کە گوتی (یأتی من بعدی اسمه أحمد). وە ڕێگا خۆشکەرە بۆ قەواعیدی شەریعەتی من لەدوایی زەمان تابعی شەریعەتی من دەبی و دەبێتە یاریدەدەری دینی من ئنجا گۆیا من و ئەو وەکو یەکترین بەڵام پێغەمبەرەکانی تر وەکوو مندالی چەند دایکانن لەیەک باووک لەبەینی من و لەبەینی ئەو هیچ پێغەمبەر نەبوو.

٨٧٨: عَن أَبي هريرَةَ (ض) أَنا اولى الناس بعيسى ابنِ مريَمَ في الدُّنيا والآخِرَةِ والانبياءُ إخوَةٌ لعَلاّتٍ أمهاتهُمْ شتّى ودينهم واحِدٌ.

## تەرجەمە

٨٧٨: دگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی لە ڕیوایەتێکی تر من لێ وەشاوەترین خەلکم بەعیسێ کوڕی مەریەم لەدونیاو لەقیامەت بەڵام پێغەمبەرەکانی تر برای یەکترین لەچەند هەوێ یان دایکەکانیان یەک نین دینیشیان یەک دینە.

(ش): لەم حەدیثە پیرۆزە تەشبیهی تەوحیدو اصولی دین کراوە بەباوک تەشبیهی فروع و ئەحکامیش کراوە بەدایک یەعنی ئەنبیا لەئەصلی دین و تەوحید هەموویان شریکن بەڵام لەفروع متفرقن گۆیا تەوحید پیاوێکە چەند ژنێکی لەفروع لەژێر نکاحدایە لەهەر ژنێک چەند کوڕی هەی. بەڵام عیسی و محمد لەیەک ژنن (معنویا) مەعنەویەن چونکی عیسی ئەگەرچی لەحیاتیخۆی عەمەلی بەئەحکامی تەورات دەکرد بەڵام».

چونکی خەبەری دا بەهاتنی پێغەمبەر (د) وە لەئاخری زەمانیش تابعی شەریعەتی ئەو دەبی و دەبێتە یارمەتی دەری شەریعەتی ئەو هەروەکوو لەیەک ئەصل بن وایە چونکی موراد اتحادی فروعە لەدونیا با زەمانیشیان یەک نەبی. ئینجیلیش ئەحکامی نیە.

٨٧٩: عَن اَبي هُرَيرْةَ (ض) رأى عيسى ابنُ مريَمَ رَجُلاً يسرِقُ فقالَ له اَسَرَقْتَ قالَ كلاّ والذي لا اِلهَ اِلاّ هُوَ فقالَ عيسى آمنتُ باللّهِ وكَذَّبْتُ عَيْني.

## تەرجەمە

٨٧٩: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بێ. پێغەمبەر (د) فەرمووی حەزرەتی عیسی سەلامی خوای لێ بێ دیتی پیاوێک دزی دەکرد. پێی گوت ئەرێ تۆ دزیت کرد. گوتی نابەحەقی ئەو زاتەی هیچ پەرستراوی ڕاست نیە ئەو نەبێ پاشان حەزرەتی عیسی گوتی باوەڕم کرد کە بەخودا سوێندت خوارد نسبەتی درۆشم وەباڵ چاوم دا ئەگەرچی بەچاوی خۆشی دیتی کە دزی کرد.

(ش) لەمە وەرگیراوە مەمنوعە حاکم حوکم بەعیلمی خۆی بکا. ئەمە مەزهەبی مالکی‌یە وە مەزهەبی حەنبەلیەکانە بەڵام شافعیەکان دروستیان کردووە لەحدود نەبێ.

٨٨٠: عَن عُمر (ض) لاتُطروني كما اَطْرَتِ النصارى ابْنَ مَريمَ فانّما انا عَبدُهُ فقولوا عبدُالله ورسولُهُ.

## تەرجەمە

٨٨٠: لەحەزرەتی عومەر دەگێڕنەوە ڕەزای خودای لێ بێ، گوتی گوێم لەپێغەمبەر (د) بوو فەرمووی لەئەندازە بەدەر مەدحم مەکەن وەکوو لەئەندازە بەدەر دیان مەدحی عیسی کوڕی مەریەمیان کرد، بەم تەرزە دەیانگوت خودایە شریکی خودایە یا کوڕی خودایە أعاذنا الله بەبێ شک من هەر بەندەیەکی خودام ئنجا بلێن عەبدی خودایە پێغەمبەری خودای هەروەکوو ئایەتی پیرۆز دەفەرموێ [لاتغلو في دينكم ولاتقولوا على اللّهِ غيرَ الحق]. لەئاینی تێ مەپەڕێن و لەسەر خودا هەرشتێ ڕاست بلێن.

(ش) ئەگەر بگوترێ ئایا کەس ادعای خوایەتی کرد دەرحەق بەپێغەمبەر (د) وەکوو دەرحەق بە حەزرەتی عیسی کرا وەلام دراوەتەوە نزیک بوو ئەم ادعایە بکرێ وەکوو پێی گوترا سەجدەت بۆ نەبەین؟ فەرمووی ئەگەر فەرمانم بەکەسێک بکردایە کە سەجدە بۆ کەسێک ببا فەرمانم دەکرد ژن سەجدە بۆ مێردی ببا.

تُطروني: لە اطرائە بە مەعنا لاتمدحوني بالباطل ولا تجاوزوا الحد في مدحي: واتە مەدحم مەکەن بەخۆڕایی وە لەسنوور تێ مەپەڕێن.

٨٨١: عَن أَبي هريرَةَ (ض) كيفَ أنتُم اذا نَزَلَ ابنَ مريمَ فيكُمْ وإمامُكُم منكمْ.

**تەرجەمە**

٨٨١: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی ـ نە ئێوە چلۆن دەبن وەکوو عیسی کوری مەریەم سەلامی خوای لێ بی بۆ ئێو ئێوە هاتە خوارێ کە ئیمامیشتان لەخۆتانە لەنوێژ بەلاّم لەکاروبارەکانی تر جگە لەنوێژ عیسی امام و ـوقتەدایە (واتە پێشەنگە) لەسەر شەریعەتی محمدیە.

(ش) ابن الجوزی گوتیتی. بۆیە عیسی لەنوێژ پێش ناکەوێ نەوەک خەلکی فکریان ـتێوێ بەم تەرزە خەیاڵ بکەن ئایا ئەوە نائبە (واتە جێگرە) یا دامەزرێنەری دینێکی ـەرەخۆیە بێتە تۆزێک لەسەر ڕوویی حەدیثی (لانبی بعدی) واتە هیچ پێغەمبەر نی‌یە ـەپاشەمن.

## باب ما ذكر عن بني إسرائيل

### باسی بەنی اسرائیل

(٨٨٢، ٨٨٣، ٨٨٤): عَنْ حذيْفَةَ (ض) إنَّ معَ الدَّجَالِ إذا خَرَجَ ماءاً ونـاراً فـامّا الذي يرى النـاسُ انها النـار فمـاءٌ باردٌ. وأمّا الذي يـرى الناسُ أنَّهُ مـاءٌ باردٌ فنارٌ(١) فَمَن أدركَ مِنكمْ فليقعْ في الذي يرى انَّهـا نارٌ فـانهُ عذبٌ باردٌ قالَ حذيفَـةُ وسمعتُهُ يقولُ إن رجُلاً كان فيمَن كانَ قبلكُمْ اتاهُ المَلَكُ ليقبضَ روحَهُ فقيلَ لَهُ هَلْ عمِلْتَ مِن خيرٍ ما أعلَمُ قيلَ له أُنظُر قالَ ماأعلَمُ شيئاً غيرَ أنّي أبايعُ النّاسَ في الدنيا. فأجازيهم فأُنظِرُ الموسِرَ واتجاوَزُ المعسِرَ فادخَلَهُ اللهُ الجنَّةَ. وقَالَ سمعتُهُ ايضاً يقولُ إنَّ رَجُلاً حَضَرَهُ الموتُ، فلمّا يَئسَ مِنَ الحياةِ أوصى اهْلَهُ إذا أنا مِتُّ فاجمعوا لي حطباً كثيراً وأوقِدوا فيـهِ ناراً حتّى إذا اكلَت لحمي وَخَلَصَت الى عظمي فـامتَحشَتْ فخذوها فاطحنوها ثمَّ انظروا يَوْماً راحاً فَذَروهُ في اليمِّ. ففعلوا فجمعَهُ اللّهُ فقالَ لَهُ لِمَ فَعَلْتَ ذلِكَ قالَ من خشيتك فَغَفرَ اللّهُ لَهُ.

---

(١) وهو البترول الذي يترتب منه الطاقة الكهربائية التي تحرق. وتغلي بها المأكولات والمشروبات كما أشاهد واجرب كل يوم في تاريخنا هذا سنة ١٣٧٥هـ

المؤلف

# تەرجەمە

(٨٨٤،٨٨٣،٨٨٢)

(ئەمە سێ حەدیثە)

٨٨٢: دەگێڕنەوە لەحوذەیفە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی. دەجال دەردەکەوی ئاوو ئاگریشی لەگەڵ دایە. ئەوەی کەخەلکی بەئاگری دەبینن ئەمە ئاوێکی ساردە وە ئەوەی بەئاویش دەبینن ئاگرە ئەسووتێنێ. ئنجا هەرکەسێ لەئێوە گەیشتە وەقتی دەرچوونی دەجال بابکەوێتە نێو ئەو شتەی کە بەئاگری دەزانی چونکی بەڕاستی زۆر ساردو شیرینە.

٨٨٣: حەدیثی دووەم: حوذەیفە گوتی بیستم لە پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی بەڕاست پیاوێک لەعالەم پێش ئێوە حەزرەتی - عیزرائیل هات ڕووحی وەربگری پێ‌ی گۆترا ئەرێ تۆ هیچ چاکەت کردووە گوتی نازانم پێ‌ی گۆترا بۆخۆت بیر بکەوە. گوتی من هیچ شتێک نازانم ئەمەندە نەبێ من شتم دەفرۆشتە خەلکی و شتم لێ دەکڕین عادەتیشم وابوو چاکەم لەگەلیان دەکرد بەم تەرزە ئەوکەسەی دەولەمەند بوایە مۆلەتم دەدا ئەوەی فەقیریش بوایە لێ‌ی خۆش دەبووم. ئنجا خودا بردیە ناو بەهەشت لەبەر ئەمەندە خودا لێ‌ی خۆش بوو.

٨٨٤: حەدیثی سێیەم: حوزەیفە ڕەزای خودای لێ بی گوتی گوێم لێ بوو پێغەمبەر (د) فەرمووی بێ گومان پیاوێک لەئەساغی دا نزیک بوو بمری وەکوو ئومێد بڕبوو لەژین لای کەس و کاری خۆی وەسیەتی کرد. گوتی وەکوو من مردم لای کەس و کاری خۆی وەسیەتی کرد دارێکی زۆرم بۆ کۆبکەنەوە ئاگری بەربدەنێ منیش بخەنە نێو ئاگرەکە. هەتا گۆشتم دەخوا دەگاتە ئێسقانەکانم. ئێسقانیشم ئەسووتێ. پاشان خۆڵەمێشی ئێسقانە سووتاوەکانیشم بهاڕن لەڕۆژێکی بەتۆزە بایی توند بەبایدابدەن بۆ ناو بەحر. ئنجا وەکوو مرد وایان لێ کرد پاشان خودای گەورە. بەشەکانی جەستەی کۆکردەوە فەرمووی بۆچی ئەم وەسیەتەت کرد گوتی لەترسی تۆ ئنجا خودا لێ‌ی خۆش بوو بەم کلمە قسەیە موشیعر بەوە کە لەخودای گەورە دەترسی.

(قەریحەی مؤلف) واتە ڕای دانەر

لەمەپێش لەچەند حدیثی پیرۆز باسی دەجال و یەئجوج و ماجوج ڕابورا. بەم تەرزە لەحەدیثی ئەبو سەعیدی خودری. عالەمی گێڕا بەدوویەش بەشێک ئیماندارن بەشێکیش یەئجوج و ماجوجن. ئینجا لەمە وەرگیرا کە مەبەست لەبەشی دووەم موطلەقی کافرە چی کتابی بێ چی مەجوسی و بوت پەرست بێ چی دەجال بێ چونکی [الکفر ملة واحدة]

واته کافر هەمووی هەریەکە. وە ڕاشبورا کە دەجال بەهەشت و ئاگری لەگەڵ دایە. لێرەش دەفەرموێ ئاوو ئاگری لەگەڵدایە نابێ ئەم دوو عبارەتی متغایرە لەسەر حەقیقەت بن لەبەر لزومی مونافات کەوایە موراد لەجەنەت و ئاو ثەروەت و دەولەمەندیو فرەوانی ڕزقە بۆ خۆشەویستەکانی سازدراوبۆ جەهەنەم. موراديش لەئاگر شەوکەت و تەسەلوطو هێزیەتی لەسەر دوژمنەکانی خۆی لەئیماندارانی صادقی بێ موعین و بەئازار لەژێر تەضییقاتی ئەحکامی بێ عەدالەتی لەگەڵ خۆ ڕاگرتنی ئیمانداران. لەسەر خواردنەوەی ژەهری ئەژدەهای دوژمنی دین کەسازدراون بۆ بەهەشت خولاصە خودای گەورە. ئەمری متضادی ئەدەست ئاوە. خۆشی. ناخۆشی. خۆشی بۆ دۆستەکانی دەجال ئەتیجەی ئاگرە ناخۆشی بۆ دوژمنانی دەجال ئەتیجەی جەنەتە.

**٨٨٥: عن أَبي هريرَةَ (ض) كانت بنو اسرائيل تَسوسُهَمُ الأَنبياءُ كلَّما هَلَكَ نبيٌّ خَلَفَهُ نبيٌّ وَ اِنَّهُ لانبِيٌّ بعدي. وسيكونُ خلفاءُ فيكثرونَ. قالوا فما تأمرُنا. قالَ فو بِبَيْعَةِ الاولِ فَالاولِ. أعطوهمُ حقَّهُمْ فانَّ اللّهَ سائِلُهُمْ عَمّا اِستَرعْاهم.**

**تەرجەمە**

٨٨٥: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر (د) فەرمووی لەزەمانی پێشوو لەزەمانی ئەنبیا لەجیاتی پاشاو واليو متصرف ئیدارەو ئەظارەتی أموری بەنی اسرائیل یان دەکرد. وەکو پێغەمبەرێک وەفاتی بکردایە پێغەمبەرێکی تر لەجێگای ئەو دادەنیشت بۆ ئەظارەتیان وەبۆ لابردنی ئەو ئەحکامانەی کەلەتەورات گۆڕیبوویان وە بەتەحقیق هیچ پێغەمبەرێک لەدوای من نیە. بەڵام لەپاش من خولەفا دەبن زۆریش دەبن. ئەصحابی کرام پێیان گوت وەکو خولەفا زۆربوون نزاع و کەشماکەش لەبەینیان پەیدابوو ئنجا چمان ئەمر پێ دەکەی یەعنی ئەو وەقتە ئێمە چی بکەین؟ فەرمووی بەجێ بگەیێن اطاعەی ئەوەل لەپاش ئەوەل لەهەموو زەمانێک. حەقی خۆیان پێ بدەن کە انقیادو طاعەتە. چونکی بەبێ شک خودا ڕۆژی قیامەت. لەخصوص موحافەظەی حقوقی ئێوە. لەوان دەپرسی ئەگەر ڕەخاوەتیان کردبی. ئەوابی حەقی ئێوە دەدا- ئەوانیش تووشی جەزا دەکا یەعنی ئێوە ئەگەر اطاعەیان ئەکەن مەسئولن ئەوانیش ئەگەر موحافەظەی حقوقی ئێوە ئەکەن مەسئولن.

٨٨٦: عَن أَبي سـعيدٍ(ض) لَتَتْبِعَنَّ سُنَنَ مِن قَبلِكُمْ شِبراً بِشِبرٍ وذراعاً بذراعٍ حتَّى لَو سَلَكوا جُحْرَ ضَبٍّ لَسَلَكْتُموهُ قُلنا يارَسولَ اللهِ اليهودُ وَالنَّصارى قالَ فَمَنْ

## تەرجەمە

٨٨٦: دەگێڕنەوە لەئەبو سەعید. سەعدی کوڕی مالکی خودری ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی بەبێ شک و شوبهە ئێوە تابعی ڕەوشتو کردارو ئەفعالی قەومەکانی پێش خۆتان دەبن لەگوناه و مەعاصی (نەک لەکفر) وەکو خواردنەوەی موسکیراتو. ارتکابی زیناو عەورەت دانەپۆشینی ژن و پیاوان و شتی تریش لەموخالەفاتی شەرعیە لەسەر موافەقەی ئەوان وەکو اتباعی بست بەبست و گەز بەگەز لەبەر شیدەتی موافەقەی هەتا بەم غایەتە. موتابەعەیان دەکەن ئەگەر بچنە نێو کونی بزن مشک کە زۆر تەنگو ناخۆشە ئێوەش دەچنە ناوی.

ئێمەش یەعنی ئەهلی مجلس پێمان گوت: ئەی پێغەمبەری خودا. لەقەومەکانی پێش ئێمە جوولەکەو دیان: فەرمووی ئەدی کێ‌یە: ئەم خەبەردانەی -بالغیبی موعجیزەیەکی گەورەو شهودیە بۆ ئێمە.

(ش) ئەم حەدیثە پیرۆزە وەکوو کەواییکە بێ کەم و زیاد هەلبڕاوە لەسەر بەڕن و بالای زەمانی نووسینمان کە سالی (١٣٧١)ی هیجریە بەرامبەر ١٩٥١ میلادی: خالەوەیهی: گوتیتی بزن مشک هەیە تا حەوت سەد سال دەژی. ناو ناخواتەوە لەچل ڕۆژێک پشکە میزێک دەکا ددانی ناکەوی عەرەب بەبزن مشک دەلێ -قازی تەیرو بەهائم- چونکی خودای گەورە وەکو انسانی دروست کرد تەیرو بەهائم هاتنەلای وەصفی انسانیان بۆکرد گوتی ئێوە وەصفی مەخلوقێک دەکەن تەیر لەئاسمان دێنیتە خوارێ. ماسی لەبەحر دەردێنی. ئنجا ئەوی بالی هەیە با بفرێ ئەوی ڕنەشی هەیە. باعارد قوّربکا بچیتە ناوی.

تـــەواو بوو ئەمەبەرگی حەوتەمە چاوەرێ ی
بەرگی‌هەشتەم بن لەم نزیکانە بە یاریدەی خودا